# نۆبەرە

«گەلاڵەیەک بۆقاموسێکی زاراوە؛»

دانەر: تاهافیضی زادە

تهران، ١٣٦٤

پێشکێش بێ به دایکم، مینا قادرزاده

انتشارات صدا و سیمای جمهوری اسلامی ایران

تهران، خیابان استاد مطهری، نبش خیابان دکتر مفتح، ساختمان جام‌جم
چاپ اول: ١٣٦٤
حروفچینی: لاینوترون انتشارات سروش
این کتاب در پنج‌هزار نسخه در چاپخانهٔ تك چاپ و صحافی شد.

بها: ١٠٠ ریال

# سه‌ره‌تا

زۆر که‌س هه‌ن ـ لاوه‌کی یان خۆماڵی ـ که‌ قاموسی زمانی کوردییان نوسیوه، نوسینی نێوه‌کانیان، له‌ چه‌ندلاپه‌ران تێ ده‌په‌ڕێ که‌ لێره‌دا، نامه‌وێ له‌سه‌رئه‌وه‌ی بڕۆم.
به‌ڵام بۆ بیره‌وه‌ری‌ده‌بێ له‌هه‌وڵ و کرده‌وه‌کۆییان ڕێزبگیرێ وسپاسیان لێ بکرێ.
ئه‌وان له‌رابردوراتاکوئه‌ورۆ به‌وکردو کۆیه‌ی خۆیان ڕێ‌وشوێنی لێ کۆڵینه‌وه‌وپشکنینه‌وه‌یان به‌رچاوخستوین. له‌وروۆش به‌دواوه و لێره‌ش به‌ولاوه، ئه‌رکی سه‌رشانی به‌ره‌ی تازه‌پێ‌گه‌یشتووه که، کرده‌وه‌ی ئه‌وان‌ره‌چاوکا. که‌به‌ئاگادارییکی پتر و تێوه‌چونێکی قوڵتروده‌ستکه‌وتێکی به‌ربڵاوتر ـ بێ به‌خۆ خورین وخۆله‌خه‌ڵکی دی‌زلتر زانین ـ ده‌ست به‌ کار ودڵ به‌ یار بێ.
یه‌کێك له‌وکارانه‌ی که‌ئه‌وان و یێ رانه‌گه‌یسشتون و بۆئێمه‌یان به‌جێ هێشتووه که سه‌ری لێ بیه‌شێنین وخه‌می لێ بخۆین، وه‌ده‌رخستنی قاموسێکه که‌نه‌ك هه‌روشه‌ی مانا لێ دابێته‌وه، به‌ڵکو وشه‌ی بردبێته‌ پاڵ وشه‌ی دی بۆ سازبونی زاراوه.
ئه‌وزاراوه‌ش به‌ نیشان دانی وێنه‌یه‌ك له‌ پێشینیان ـ به‌یت، گۆرانی، لاوك، هه‌ته‌لۆکه، مه‌ته‌ڵ و قسه‌ی نه‌سته‌ق وهۆنراوه‌ی شاعیران ـ لێك درابێته‌وه.
بێتو که‌سێك له‌وقاموسه‌ی که‌له‌به‌ره‌وه باسمان لێ کرد، که‌ڵك وه‌گرێ، بۆی‌ڕون ده‌بێته‌وه که، بۆوێنه: چاوڕێ‌خشاندن، چاولێ کردن و تێ‌ڕوانین، یه‌ك‌نین وجێ‌ی به‌کاربردنیان فێرده‌بێ.
له‌ئاکامدا: وه‌ختی زۆرتر بۆده‌گه‌ڕێته‌وه، خه‌ڵك چاکتر له‌ مه‌به‌ستی ده‌گه‌ن، قه‌ڵس و وه‌ڕه‌زی خراپ تێ گه‌یشتن و خراپ تێ گه‌یاندن نابێ.

هاتوئەوکەسە، یەکێکی دواندا وپێی کوت: «شتێکم نوسیوە پێم خۆشە بیبینی و پاش خوێندنەوەی بۆم ڕێك و پێك کەی.»

ئەگەر بزانێ گوێدێرەکەی ئەوەندەی کارهەیە، سەری خۆی پێ ناخورێ، پێی دەلێ: «تکایە هەرچاوێکی ڕێ بخشێنە.»

ئەگەر زۆریشی کارنەبێ، پێی دەلێ: «چاوێکی لێ بکە.» بێتو کاریشی نەبێ وتامەزروش بێ، پێی دەلێ: «بۆم تێ بروانە.»

ئێستێ کاتێك وت و وێژی خەلکیمان گوێ لێ دەبێ، یان نوسراوەکان وهۆنراوەکانی هێندێك لە نوسەرەکان وشاعیرەکانی کورد دەخوێنینەوە، جاروبار وشەوزاراوەی لاوەکی وداتاشراوی ڕەق وزەق مان دێتە بەرچاو، کە بەشیان بەسەرزمانی کوردیوە نیە.

ئەگەرقاموسێکی من کوتەنی، زاراوەیی، هەبێ دەبێتە پەرژینێك بۆ لێك کردنەوەی قسەی بێ هێزلە قسەی بەهێز ونوسراوەی بێ پێزلە نوسراوەی بە پێز. هەروەها پاشەکەوتێکی بەنرخە بۆ بەرەی دوا ڕۆژ کە بەمیرات پێی دەبرێ وبەسەریدا دەکەوێ و لەبەروبوی دەحەسێتەوە.

لێی فێردەبێ کە ئەویش شتێکی بەجێ بهێلێ بۆ، بەرەی پاش خۆی وهەمو نەتەوەکانی دنیا.

هێندێك کەس پێیان وایە زمانی کوردی، بەرتەسکە وگەلێکیش لایان وایە، بەربلاوە. لەهەرکامیان بێ، پێداویستی بەو خزمەتەی هەیە.

**من دابی ڕێك خستن وداڕژتن ونوسینی ئەوقاموسەم ـ کە هێشتا هەردەنگی هەیەو ڕەنگی نییە ـ لەونامیلکەیەدا، بۆ خوێنەر داخستووە.** لێرەدا خوێنەری بەڕێز دلی ئۆقرەی ناگرێ وپێشە برەم لێ دەگرێتەوە وتامەزرۆی ئەوەیە بزانێ: زمانی کوردی لە کامیانە. بەلام من لەباتی ئەوەی بیروباوەڕی خۆم دەربڕم، **تاقەوێنەیەکی** دەخەمە بەرچاو.

دیتنی شێوەی ڕێك خستن وتێك خستنەوەی ئەو وێنەیە، بۆخوێنەر دەبێتە هەوێنی پێك هێنان و وەدی هێنانی قاموسەکە.

لەلایەکی دیکەشەوە، دەبێتە پنجێك کە بیروباوەڕی خوێنەری لێ دەڕوێ، دەبێتە

بناخه‌وبنچینه‌یه‌ك كه روانگه‌ی وی له سه‌رهه‌ڵده‌چندرێ. ئه‌و وێنـه‌یه: مێـوژێكه لـه
كه‌ویژێك وكێوژێكه له بارێك، دڵۆپه‌بارانێكه له رێژنـه‌یه‌ك ویـه‌كێكه لـه لێژنـه‌یه‌ك،
په‌رتوكه‌نانێكه له ده‌سته‌وارێك ودارێكه له‌لێره‌وارێك، برێكه له گه‌لێك ومه‌رێكه لـه
مێگه‌لێك.

ئه‌ووێنه‌یه‌چاوگ (مَصْدَر) ی ـ چو ن ـ ه‌ كه‌ره‌گه‌ڵ پێشبه‌ندان وپاشبه‌ندان ونێو (اسم)
ان... م خستو وه‌ وزۆر لكی لێ بو وه‌ته‌وه‌ وهه‌رلكه‌ی هێندێك كه‌شم (صورَت) ی پێوه‌یه‌.

هه‌ركه‌شمه‌م هه‌ربه‌تاقه‌ رسته‌ (جُمله) یه‌ك لێك داوه‌ته‌وه‌. (مانا، بارته‌قای رسته‌یه‌.)
كه‌وابو مانام ده‌قاوده‌ق بۆ نه‌نو سیو ن. بۆیه‌ش چاوگم ده‌ست نیشان كردووه‌ كه‌هه‌روه‌ك له
نێوه‌كه‌ی رادیاره، سه‌رچاوه‌وكانی ئاوه، بۆ كردار (فِعْل)ه‌ كان وكرداریش ئه‌ستونده‌كی
تاوڵی زمانه‌و تیغه‌ره‌ی پشتی رێزمان.

وابزانم له‌رابردوراتاكوئێستێ ٢٥ قاموس (فه‌رهه‌نگ) ی زمانی كوردی پێكه‌وه‌
نراون وسه‌رله‌ به‌روبه‌ره‌ به‌به‌ره ـ خودا پێمـان ره‌واببینێ ـ ئه‌وكـاره‌ رێك وپێـك‌تر،
پوخت وپاراوتر، له‌بارتروبێ خه‌وش تر بو وه‌و به‌ره‌و پێشكـه‌وتن رۆیوه. بـه‌رهه‌می
هه‌ره‌نو ێ ی قاموس رێكخستنی زمانی كوردی، قاموسه‌ باوه‌ رپێ كراوه‌كه‌ی مامۆستا
زه‌بیحی یه‌.

پێم‌وایه‌ كاتی وه‌ی هاتو وه‌ كه‌ چه‌ند لكێك له‌ داری پێ گه‌یشتو ی قاموس رێكخستنی
زمانی كوردی برو ێ‌وهه‌روه‌ك مه‌عروف قه‌ره‌داغی مردۆخی، له‌سه‌ره‌تای فه‌رهه‌نگی
كشت وكاڵه‌كه‌ی خۆی دا رایگه‌یا ندووه‌ (فه‌رهه‌نگی كشت وكاڵ، به غدا، ١٩٧٣، ٢
به‌رگ): ده‌بێ زمانی كوردیش وه‌ك زمانه‌كانی تری سه‌روبه‌ندی ئێمه، چه‌ند جوره
قاموسی تروه‌ك قاموسی زانستی، قاموسی پیاوه‌ به‌نێوبانگه‌كانی كورد، و قاموسی
زاراوه‌یی به‌ خۆیه‌وه‌ ببینێ تاچاكتر پێداویستێكانی خه‌ڵك پێك بێنێ.

به‌دوای فه‌رهه‌نگی كشت و كاڵ، ئه‌وامن گه‌لاڵه‌یه‌كم بۆ سازبو نی قاموسی زاراوه‌یی
زمانی كوردی ـ كه‌ ئێستێ به‌ ده‌ستانه‌وه‌یه‌ ـ پێكه‌وه‌ناوه، كه‌ بێتو باش بێ وپه‌سند
بكرێ‌هیوام وایه‌ كه‌سێك یان چه‌ند كه‌سێكی دی ئه‌و گه‌لاڵه‌ی بكه‌نه‌ هه‌وێن بۆ دارژتنی
قاموسی زاراوه‌یی زمانی كوردی.

خوێنه‌ری خۆشه‌ویستم، دوای خوێندنه‌وه‌ی ئه‌و نامیلكه‌یه‌ پوچه‌كانی لێ هه‌ڵاوێره‌و

سوچه‌کانی لێ هه‌ڵوه‌ژێره‌ ومنیش ئاگادارکه‌، بۆم بنوسه‌، پێم بڵێ ولێم رابسپێره‌. ئه‌گه‌ر که‌ڵکیشی نه‌بو به‌سه‌رم داده‌وه‌، ماڵی قه‌ڵب سه‌روه‌ ساحێبی! ئه‌گه‌ر لێشم قه‌ڵسی، ئه‌وا پشتی من وداری تۆ!

**تاها فه‌یزی زاده‌**

## چون، لە گەڵ پێشبەندان:

بۆ + تێ + وە + چون = بۆتێوەچون. وەك: لە بەرم گران نییە، پێم خۆش بێ سەرم لەوکراسە یەوە بۆتێ وە دە چێ، زۆر تە نگ نییە. یان: لە سە رخێران، وە ختێك ژنێ بهێنی لە جل هە ڵگر تنێ دا ناهێڵم زە برت رێکەوێ، بۆخۆم بۆت تێ وە دە چم. زۆر دە ر بە ستی مە بە.

بۆ + چون = بۆچون. وەك: تائەورۆ کەسێك ولآمی ئەو هەتەڵۆکەی نەدیوە تەوە. ولآمی تۆش زۆرباش نییە. بەڵام چاکی بۆچوی. یان:

بۆت دینم، بۆت دێنم، بۆت دێنم لەومو رسایە،

ئە گە رئێران لێ ی نە بێ، بۆت دە چمە ئو رپایە.

یان: بارێکی قو رست بۆتێك ناوم وبۆت داگر توم. ناتوانم هە ڵی گرم وبۆم ناچێ یان:

بۆ بازرگانی دە چمە شنۆیە کراست بۆدێنم لە گوڵی لیمۆیە.

یان: وە ختێك هە ڵۆ دێیەوێ نێچیری بگرێ، بۆی دە چێ و تێی رۆدێ. یان: من وای بۆدە چم و تاری مامۆستاکەم هە ڵەی تێدا نە بو.

بۆ + دەر + چون = بۆدە رچون. وەك: بە ئێمەی دە کوت: لە چ شتێك مە تر سن و هە مو کە ندو کۆسپێك لە سە ر رێتان لادە ن و لە تە نگانان دالە سە رە خۆ بن، کە چی وە ختێك کەموسکێك نەهاتی روی تێ کرد، چوکی داداولە بەرە گەدانەما و بۆی دە رچو وقەل فری کرد!

بۆ + لا + چون = بۆلاچون. وەك: پولێکم دابو بە براکەم دوێنێ چوم بۆلای کە لێی بستێنمەوە. یان: نیشانە یەکم بۆت داکردبو کە بە تفەنگ پێوە نێی. بەڵام

نەك هەر لە باڵت نەكرد، بەڵكو بۆلاشی نەچوی.یان: تاشتی تەڕوبڕهەبێ، بۆلای شتی ئیشك وبرینگ ناچم. یان: لەبەر ئەوەی پیاوێكی چاك نییە، قەت خۆی تێ مەگەێنە ولای لێ لادە و بۆلای مەچو!

بە +.....+ چون. وەك: لام وایە بەسواری چووە نەك بەپێیان. یان: لام وایە ئەوەندە سەهەندە یە، بە هیچ ناچێ! یان: دیارە لە مێژە بابت ئەمری خودای بە جێ هێناوە وعومری داوە بەحازریان. بەلام نازانم ئەوخوداڵێ خۆش بووە، بەچی چووە؟

بە + سەر + ئەوە + چون = بەسەرەوەچون. وەك: لەبیرت بێ كە كتێبەكەت لێ سوتاندم، جا بەسەرتەوە نەچێ، تۆڵەی خۆمت هەرلێ دەكەمەوە! یان: ئەتۆ لەكوێ بەلای منەوە هاتویوكەنگێ لەدوی قسەی منت داوە؟ كەوابومنیش بەوەختی خۆی بستێكت بەسەرەوەناچم. گلەییم لێ نەكەی، دنیاروی بێژینگێیە، چۆنم دە بینی، وات دە بینم.

بە + سەر + دا + چون = بەسەرداچون. وەك: لێیان خەفتام وقەرە بەقەرە یان ڕۆیشتم ولە جێیەكی دەگیرم خستن. كاتێك خوت وخافڵ بەسەریان داچوم، عەبەسان.

بە + لا + وە + چون = بەلاوە چون. وەك: كاتێك شتێكی لە نێوان خۆمان وخەڵكی دا بەش دەكەین، نابێ هەربۆلای خۆمانی دابشكێنین، یان چ وە بەركەس نەهێڵین: خۆمان پڕ كەین وخەڵكی قڕ. بەڵكو چاك ئەوەیەزۆرتری بەلای خەڵكی یەوە بچین.

پێ + تێك (دە+یەك) + چون = پێ تێك چون. وەك: هێندێك جل وبەرگ هەن بێتو بیانشۆین، پێی تێك دەچن. یان: ژنە كەقسەی ناخۆشی بە مێردەكەی كوت. مێردەكەزۆری پێ تێك چو.

پێ + چون = پێ چون. لەرێگایەزۆری پێ چووە. لەئاشی دێیەوێ تێی هەڵێنێتەوە! یان: هەرچی لەوكورەتۆرەدەبم وپێی دەكەم كەدەست بزێو یيە نەكا، بەگوێی دا ناچێ وپێ ناچێ! یان: لەسەر ئەوكارە خراپانەی كەخوی پێگرتووە، هەرچەندە سەركۆنەی دەكەن وتانەوتانوتی لێ دەدەن وجاری وایە لێشی دەدەن،

بەڵام پێ ناچێ، دوایە هەردەڵێی نەبای پێ داهاتووەو نە بۆران!

پێ + دا + چون = **پێ دا چون**. وەك: بەو رێگایەی داچوی بۆ شارێ؟ـ نە، **پێی دانەچوم**. یان: ئێستێ هەوروهەلایە، زۆری **پێدا ناچێ** کەدەبێتەوە تاو وساو.

پێ + دا + هەڵ + چون = **پێداهەڵچون**. وەك: جارێکی **پێ ی دا هەڵچوم**، کۆڵەواربوم. ئیدی بە سمە!

پێ + وە + چون = **پێوەچون**. وەك: براکەم لە حەجێ هاتووەتەوە، بەلام من هێشتا **پێوە نەچوم** و نەمدیوە. یان: بێتو زوسەر لەوبرینەی نەیەشێنی، وردە وردە دەتەنێتەوە وهەمولەشت دادەگرێ و**پێوە دەچێ**! یان: هەودا دەزوە کە بەسیخمە کەیەوە نوساو دەگەڵ خۆی بردی. بەڵام نەیدەزانی دەزوەکەی پێیەوەیە و **پێوەچوە**!

پێ + وە + هەڵ + چون = **پێوەهەڵچون**. وەك: منداڵی واهەیە تا دارێکی بڵیند دەبینێ، **پێوەهەڵدەچێ**. ئیدی نازانێ بێتو بەربێتەوە، سەری تێدادەچێ!

پێ + هەڵ + چون = **پێ هەڵچون**. وەك: دومنداڵ لە بن دارێکی تۆپێنیان دەکرد. لەناکاوتۆپەکەیان کەوتەسەرداره کەوبەلك وپۆ پێوە گیر ساوە. هەرچەنددارە کەیان ڕاتڵەکاند، بەرنەبۆوە. یەکێکیان **پێ ی هەڵچو** وهێنایە خوارێ.

پێ + هەڵ + ئا + چون = **پێ هەلاچون**. وەك: ئی واهەیە **پێ هەلاچون** بە کێوی چر وهەڵەموتی لەبەرگران نییەوبۆی وەکوئاوخواردنەوەوایە. بەلام لە **پێ هەلاچون** بەشاخی ژیان زەندەقی دەچێ

تێ + چون = **تێ چون**. وەك: لەوچەنددلۆپە دەرمانەی کە لەچاوت کردهەر دڵۆپێکی **تێ چو**. یان: ئەو خانووەی کە چەند ڕۆژلەمەوبەر کرێوتە، چەندی **تێ چووە**؟

تێ + دا + چون = **تێداچون**. وەك: ئەوەی هەمبو نەمبودام بە بنەتۆ و، بۆداچاندنی موچەوکێڵگەکەمان. لەبەرئەوەی ساڵ خۆش نەبو، دەغڵە کەم بۆرەنێو نەهات وبنەتۆوە کەشی دەرنەهێناوە. بەداخەوە **تێداچوم**!

تێ + ڕا + چون = **تێڕاچون**. وەك: وشیاربە، ئێرە درك وداڵی زۆرە،

تێت رانه‌چن و بریندارت نه‌که‌ن.

تێ + رۆ + چـون = تێ رۆچون. وه‌ك: بـۆنه‌وه‌ی ده‌رزی وتـه‌به‌نـه‌ت تێ رۆنه‌چێ، نابێ له‌به‌رده‌ستانیان دانێی.

تێك (ده + یه‌ك) + چون = تێك چون. وه‌ك: ماڵه‌ مێر وله‌ی به‌دڵۆپێك باران، تێـك ده‌چێ. یان: لـه‌ مێـژه‌ نێـوانمـان پێکـه‌وه‌ نییـه‌ و تێـك چـوین. یـان: کاتێك قسه‌ که‌م سه‌رله‌ به‌ر بۆگێر اوه‌، ره‌نگی به‌رویه‌وه‌ نه‌ماوزۆر تێك چو.

زاواله‌ بوکێ مه‌ده‌، زاواله‌ بـوکێ مه‌ده‌
ئه‌گه‌رله‌ بوکێ بده‌ی، تێك ده‌ چێ ده‌ سره‌وشه‌ده‌.

تێك (ده + یه‌ك) + و + پێك (به + یه‌ك) + چون = تێك و پێك چون. وه‌ك: له‌ زۆر بنه‌ماڵان داکاتێك گه‌وره‌ی ماڵێ ده‌مرێ، رێ وشوێن وچونێه‌تی ژیانی ئاسایی ماڵه‌ که‌ تێك و پێك ده‌چێ.

تێ + وه + چون = تێوه‌ چون. وه‌ك: پێش پێت قوره‌، وشیاربه‌ تێ یه‌وه‌ نه‌چی! یان: پێم خۆش نه‌بو ئه‌و کاره‌ی بکه‌م، به‌ڵام ئه‌وه‌نده‌ یان لێ راێه‌ سپاردم وهانیان دام وهه‌مو رێگایه‌ کیان لێ بریمه‌وه‌ که‌، منیش به‌ ناسه‌رسه‌نگی پێی داکه‌وتم و تێ یه‌وه‌ چوم. یان: ئه‌و پێڵاوه‌ پاره‌ که‌ده‌ پێی کوره‌ که‌مه‌وه‌ ده‌چو، به‌ڵام ئه‌وسـاڵ که‌ گه‌وره‌تر بوه‌، پێی تێوه‌ ناچێ.

تێك (ده + یه‌ك) + هه‌ڵ + چون = تێك هه‌ڵچون. وه‌ك: شه‌ری قورس له‌ نێوان چاکان وخراپان داهه‌یه‌. له‌ وتێك هه‌ڵچونه‌ی داجارجارچاکان سه‌رده‌کـه‌ون وهێندێك جاریش به‌ داخه‌وه‌ خراپان زاڵ ده‌بن.

«چون. وه‌ك:

ده‌چم بۆپێنجون، پێنجم بێ ده‌چێ — هه‌تـادێمـه‌وه‌ تـاقـه‌تم ده‌چێ.

یان: دوێنێ ئه‌وه‌نده‌ ساردو به‌ سته‌ڵه‌ك بو، ده‌ستم چوبون، ده‌تکوت لێ په‌رین. یان: ژماره‌ی دراوه‌ که‌م درابو له‌ کاتی شتومه‌ك کرین دابه‌ هه‌رکه‌سم ده‌دا به‌سه‌ریان دا ده‌دامـه‌وه‌، چـونکـو نـه‌ده‌چـو. یـان: ئـه‌وکـابـرایـه‌ شـه‌پله‌ی لێ داوه‌. لایه‌کی به‌ده‌نی چوه‌. یان: چومه‌ لای دوکتۆر، گه‌لێك پوڵ وپاره‌م له‌ خۆم خه‌رج کردو زۆرم چو.

دەر + چون = دەرچون. وەك: وەها كەندوكۆسپ تەنگیان پێ هەڵچنیوم، كە ڕزگاریم بۆنییەودەرناچم ودەرەتانم نییە. یان: لەوتاقی كردنەوەی دوێنێ داباشم. لاموایە دەردەچم. یان: تفەنگەكەم پڕكردبو، بێ ئەوەی پەلە پیتكەكەی ببزێوم دەرچو. یان: دەرچو ئەوسەزدەمەی بڕەم بڕەمی دەسەلاتت بو. یان: ئەوگۆڤارە هەموچوارشەممۆیان دەردەچێ وبڵاو دەبێتەوە. یان: ئەگەر بەوردی لێك بكۆڵینەوە، بەخزم دەردەچین. یان: كەوشە ڕەشەكەم زۆر درەنگ دڕاوچاك دەرچو.

ڕۆ + چون = ڕۆچون. وەك: تكایە بەجێی ڕوخەك دامەڕۆدە نا ڕۆدەچێ. یان: نانی گەڵاگەڵا نەبێ بەگەروم ڕۆناچێ.

لە + بەر + چون = لەبەرچون. وەك: لەگەڕەكی ئێمەژنێك زگی پڕبو. وختێك زا، منداڵەكەی بە ساغی نەبو ولەبەری چو!

لە + بەر + ئەوە + چون = لەبەرەوە چون. وەك: پاش ئەوەی دوسێ جار، چۆغەكەیان بۆشوشتوم، تێك چووەوئیدی بۆبەرم نابێ ولەبەرمەوە ناچێ. بێتو بە سمرسمریش لەبەری كەم، هەڵدەدڕێ. یان: دوای ئەوەی ئاشت بوینەوە، ئێستێ ئەوەندەیەكترمان خۆش دەوێ وجوتین كەتەنانەت دەرزیشمان لەبەرەوەناچێ.

لە + بەر + یەك + چون = لەبەریەكچون. وەك: هەركۆمەڵێك ڕێ وشوێنێكی تایبەتی هەیەووەكوكاتژمێر كاری دەكا. بێتوداب وڕێ وشوێنەكەی بەكەڵك نەیە، لەبەریەك چونی باشترە.

لە + باڵ (پاڵ) + یەك + چون = لەباڵ یەك چون. وەك: ڕەورەوەیەكم بۆمنداڵەكەم كڕیبو پێی بڕوا، وە ختێك كە گەورەتر بو ئەوەندەی بەداروبەردی داداكە لەپاڵ یەك چوە ولەكەڵك كەوتووە.

لێ + چون = لێچون. وەك: گۆزەكەم پڕكردبو لە ئاو و لە جێی خۆی دامنابو. نم نم لێ ی چوبو،تەنانەت دڵۆپە ئاوێكیشی تێدانەمابو.

لێ + دەر + چون = لێدەرچون. وەك: تفەنگەكەم پڕكردبو ودامنابو. بێ ئەوەی پەلەپیتكەكەی بترازێنم دەنگێكی لێ هاتو گوللەكەی لێدەرچو.

وه + بەر + هەڵ + چون = وەبەرهەڵچون. وەك: لە تە نیشت دارچنارێکی، لاولاوێك شین ببو. لاولاوەکە بەرەوسەرچڵوکی دارەچنارەکە وەبەری هەڵچوبو.

وه + ... + چون = وە شتێك چون. وەك: ئەوگوڵە وەو گوڵەی دەچێ.

وه + یەك + چون = وێك چون. وەك: ئەودوبرایانەئەوەندە وێك دەچن، هەردەڵێی سێوێکن لەتت کردون.

وێ + چون = وێچون. وەك: ساوە، وێناچێ بباریٚ. یان: ئەونوسەرەگەلێك زاناوبلیمەت و وێچووە.

هەڵ + چون = هەڵچون. وەك: چاك بو زو گەیشتمە چێشتەکەی، بەغوررەمدە کوڵی وقوڵتی دەدا، دەناهەڵدەچو. یان: وەختێك ئەوقسەم پێ کوت، هەڵچووئەوی بەسەرزمانی داهات، پێی کوتم. یان: کەچەڵ، کەچەڵ هو، بەدارێ هەڵچو، چەرمی سەری لە بیر چو. یان: هەڵستە سەرپێ و هەڵچە (هەڵ + بچوٚ) شەپێکی، لەوقومارەدا دۆڕاندوتە. یان: درویەکم لەپێی هەڵچووەتەوا وێك جێیەکەی ژانێ دەکا.

## چون لەگەڵ پاشبەندان وپێشبەندان:

بۆ + تێ + هەڵ + چون + ئەوە = بۆتێ هەڵچونەوە. وەك: دایەگیان، پێشو زۆرم خزمەت پێ کردوی وئەرکی سەرشانیشمە کەلەخۆمت خۆشترم بوێ. بەڵام سەردەمێك بونەخۆشی پرزەی لێ بریبوم وپێم نەدەکراپێت رابگەم. ئێستێ کەچاك بومەوە و وەك گوێزی ئازام لێ هاتووەتەوە، جا بۆت تێ هەڵدەچمەوە.

بۆ + چون + ئە + سەر = بۆچونەسەر. وەك: نابێ هەرچی منداڵ کوتی بەقسەی بکەی، دەنابێتو بزانێ دەستی وەبەردەستی ناهێنن وهەرچی بڵێ بۆی دەچێتەسەر، ئیدی لەکاری خراپ ناگەرێتەوەوبەچاکی ناعاملێ. یان: شتێکی وابڵێ بۆت بچێتەسەر وخەڵك حەقت لەدوی بدا.

پێ + دا + چون + ئەوە = پێداچونەوە. وەك: پاش ئەوەی شتێکم نوسی پێدادەچمەوە، نەکاوشەیەك یان مەبەستێکم لێ هەڵبواردبێ یان وەسەرم خستبێ،

یان بەهەڵە چو بێتم.

تێك (دە + یەك) + چون + ئەوە = تێكچونەوە. وەك: دوسێ ڕۆژ بو پێکەوە ئاشت ببوینەوە، بەڵام زۆری پێ نەچو کە لەسەر ڕاتێك چوینەوە.

تێ + هەڵ + چون + ئەوە = تێ هەڵچونەوە. وەك: سەردەمێك بولە پەستاو بێ وچان کتێبم دەخوێندنەوە. لەدوایی دالێیان وەرەزبوم ووەلام نان. بەلام چەندرۆژێکە تێم هەڵێنا وە تەوە وتێ هەڵچومەوە.

چون + ئە + سەر = چونەسەر. وەك: تکایە لە خواری دامە نیشە. بچووە سەر. یان: ئەورۆ وەها بە خۆی دادێ و دەچێ دەڵێ ی دەچێتە سەر شاییە. یان: هەمو ڕۆژی هەینیان دەچمەسەرقەبران. یان: خوت وخافڵ چومە سەریان تەقەم لێ کردن. یان: بالەسەر ئەومە بەستەی نەڕۆین و بچینە سەر باسێکی دی.

چون + ئە + پاڵ = چونەپاڵ. وەك: ئەووشەیە چووەتە پاڵ وشەکەی تر ووشەیەکی نوێ ی لێکدراوی پێك هێناوە.

چون + ئە + ژێر = چونەژێر. وەك: ئەوقسەی کەوا لە منی دەگێڕنەوە، من نەمکوتووە وئی من نییە کە وابو ناچمە ژێری.

چون + ئە + بەر = چونەبەر. وەك: مەچووەبەر بارانێ، تەڕ دەبی. یان: کوڕەکەم چەند ڕۆژە چووەتەبەر مەری.

وادە گێڕنەوە، شێخی سەنعان لەسەرئەوهەمو لەخودا ترسییەومو سوڵمانەتی خۆی ڕا، بەقسەی کچەگاورێکی لەدین ڕگەراوچوەبەررازان. بەڵام زۆری پێ نەچو کەزانی بەهەڵەچووە و هاتەوە سەررێی ڕاست وبەرە وئیسلام کچەکەشی وەدوی خۆی خست.

چون + ئە + سەر + یەك = چونەسەریەك. وەك: وەختێك ماش ولەپە ودانەوێڵەی دی هەڵتەکێنین، دادە پەستێودرێن وجێی کەمتر دەگرن ولەبەرئەوەی دەچنەسەریەك، قورستردیاری دەکەن.

چون + ئەوە = چونەوە. وەك: ئەوژنە لە مێردەکەی زیزببو (تۆرابو) و چوبووە ماڵی بابی.

چون + ئەوە + سەر = چونەوەسەر. وەك: بە خزمایەتی دەچێوە سەر کێ؟

چونکو نازانم سەروە کێیە؟ یان: لە سەر ئەوهەمودە ولەت وداهاتەی را، چوینەوە سەر هەواری خالی.

چون + بۆ = **چون بۆ**. وەك: **چون بۆ** گەرانێ، هەتائێواریێ ناگەرێنەوە.

چو + ئاندن = **چواندن**. وەك: ژمارەی پولەکەم (پارە کەم) درابو ونەدە چو. چومە بانك، **چواندم**. یان: ئەتۆیان لە شاییە بانگ هێشتووە، بەلام لە منیان نە گێراوە تەوە، **نام چوێنی**؟

چو + ئاو = **چواو**. وەك: هەرپولێك کە بچێ پێ ی دە لێن: دە چێ. دیارە **چواوە**. بۆیە وای پێ دە لێن.

لێ + چون + ئەوە = **لێ چونەوە**. وەك: مریشکە کەم هێلکە کەرە. بەلام دە مێکە هێلکە ناکاولە هێلکە (هێلکە کردن) **چووەتەوە**.

هەل + چون + ئەوە = **هەلچونەوە**. وەك: شیرە کە هەلچو بو. لە سەر ئاوریم داگرت. لەسەررالە سەرئاوریم داناو ئاورم لێ خۆش کرد. لە پرێك **هەلچووە**.

## چون، تێکەلاوی نێوان (اسامی):

ئابرو + چون = **ئابروچون**. وەك: کابرایە کیان لە سەردزیە، لە بەستێنی چۆمی لە خیزی گرت، واشیان لێ نە کردبائەوکارە هەر **ئابروچون ی** پێوە بو!

ئیشتیا + بۆ + چون = **ئیشتیابۆچون**. وەك: ئەوە ندە نە خۆشم چم پێ ناخوری و **ئیشتیام بۆ هیچ شتێك ناچێ**!

ئیشتیا + چون = **ئیشتیاچون**. وەك: پیاونابێ ئەوە ی **ئیشتیای چویە** بیخوا، تە قا، بە بەدە نمان نە کەوێ.

بانك + دەر + چون = **بانك دەرچون**. وەك: ئەوجارنۆرەی کاك سوارە گەیشت کە بانك دانێ. بێ ئەوەی زۆری پێ بچێ، پر بو و **بانکی دەرچو**. یان: کاك ئەحمەد زۆرلە مێژە ـ خوداپیی رەوا ببینێ ـ ئە نگراوە و ئیدی پە کی بە کاسبییەوە نە کەوتووە و **بانکی دەرچووە**.

بز + چون + ئەوە + ئی + چاو = **بزچونەوەی چاو**. وەك: ئەوکابرایە لە بن لیفەیەوە **چاوی بزدەچۆوە**.

بۆ + لە + دین + دەر + چون = **بۆلەدین دەرچون.** وەك: شێخی سەنعان کچێکی گاوری زۆرخۆش دەویست. **بۆی لە دین دەرچو.**

بە + با + چون = **بەباچون.** وەك: دەغڵ ودانێکی زۆرم داچاندبو. بەڵام سەرماڵێی داونەی گەیاندێ. داخەکەم ڕەنج بەخەسار بوم وبەرهەمی حەول ودەولەکەم بەباچو.

بە + بنج + و + بناوان + دا + چون + ئە + خوار = **بەبنج وبناوان داچونەخوار.** وەك: کاتێك گۆڤارێکی بە دەستەوە دەگرین و دەمانەوێ بیخوێنینەوە، نابێ سەرسەرەکی تێی بڕوانین. بەڵکو دەبێ مەبەستەکانی لێك دەینەوەو لێیان بکۆڵینەوە وبەدڵی بسپێرین. بەکورتی بڵێین: **بەبنج وبناوانی دابچینەخوارێ.**

بە + پیر + ئەوە + چون = **بەپیرەوەچون.** وەك: وەختێك حاجی لە حەجێ دەگەڕێنەوە، پێش ئەوەی بێنەوە ماڵێ، خزم وکەس ودراوسیەکانیان **بەپیریانەوە دەچن** و وێکڕا دەگەڕێنەوە ماڵێ.

بە + ... + چون = بە... چون. وەك: بەپێ کەنینەوە چون. **بەگریانەوەچون. بەگریان چوە ماڵێ.** یان: ئەویش هەر بە دەردی بابم‌چو. یان: **بە پێیان چوەتە گەرانێ.**

بە + خۆ + دا + هاتن + و + چون = **بەخۆداهاتن وچون.** وەك: ئەوڕۆژۆر خۆی تیفتیفەدەدا وبەخۆی ڕادەگاوخۆی لە تەخم و تەدارەك دەداو **بە خۆی دادێ ودەچێ.** هەردەلێی دەچێتە سەر شاییە.

بە + خەسار + چون = **بەخەسارچون.** وەك: ئەوجاجمە جاجمی چاکە، ئەوی پێی بدەی **بەخەسارناچێ.** یان: ئەنگێوەی چاکە، هەرگوللەیکی بی هاوێ لە نیشانەی دەدا، و **فیشەکی بەخەسار ناچێ.**

بە + دوا + دا + چون = **بەدواداچون.** وەك: کابرالەپێش‌دا دەڕۆیشت ومن **بە دوای دادەچوم** و شوێنیم بەرنەدەدا، تاکو گەیشتمەوەسەری. یان: **بەدوای ئەو منداڵەی دا بچو**، نەکا ون بێ.

بە + ڕێ + چون = **بەڕێ‌چون.** هێندێك کەس هەن ژیانی بنەماڵێك، بگرە وڵاتێك بەڕێوە دەبەن بێ ئەوەی بۆی سەخڵەت بن یان خەمی بۆ دابگرن. ئی

واش هەن تەنانەت خۆشیان پێ بەرێ ناچێ.

بە + رێ + وە + چون = **بەرێوەچون.** وەك: هێندێك ماڵ، گەورەی باشیان لێ هەڵکەوتووە وبە چاکی **بەرێوە دەچن.** لەتەنگانان، ناکەون وبەردی سارد وگەرمیان وە بەرپێ نایە.

بە + زایە (ضایع) + چون = **بەزایەچون.** وەك: بەدارە میوەکان زۆرراگەیشتم، بەلام سەرمای ئەوساڵ کاری لێ کردن وهەمو یانی وشك کرد. حەولەکەم **بەزایە چو!**

بە + سەر + چون = **بەسەرچون.** وەك: پاش تەنگانان، فەرحانەیە، تەنگانان بەریان کورتە، تەمی خەم دەرەوێ و**بەسەردەچێ** وبەسەرخۆشیاندا دەکەوین.

بەش + چون + ئەوە + سەر + بەش + ئان = **بەش چونەوەسەربەشان** وەك: هێندێك جارپێش ئەوەی بەشەمیرات بەکابرایەکی ببرێ، دەمرێ وبەشی ویش بە میراتگرەکانی دیدەبرێ! جابۆیە دەڵێن: یاخودا **بەشت نەچێتەوە سەربەشان.**

بەفر + چون + ئەوە = **بەفرچونەوە.** وەك: هەموساڵێ لەمانگی رەشەمەدا، رەشانگ دەکەوێتە لاپالان و نواڵە بەرهەڵدە بن ورنولە کوێستانان دەپسێن، وردە وردە **بەفرچۆرچۆرەی** دەکەوێتێ ودە **چێتەوە.**

بە + فریو + چون = **بەفریوچون.** وەك: هێندێك کەس زۆر بەفڕوفێڵن وخەریکن خەلکی بەفریو بەرن. ئێمەدە بێ زۆرئاگامان لە خۆمان بێ وبەگۆنگەڵ وتەڵەکەی ئەوان **بە فریونەچین.**

بە + فیڕۆ + چون = **بەفیڕۆچون.** وەك: جاری واهەیە دەستکەوتی چەندساڵە و پاشەکەوتی وەکۆکراوو دەغڵ ودانی داخستراومان، بە نەختێك کەمتەرخەمی **بەفیڕۆدەچێ** ولەساجی عەلی دەدرێن.

بە + قەڵفەز + چون = **بەقەڵفەزچون.** وەك: ئەوکابرایە پانتۆڵێکی تازەی کری بو، بەکوچەباغێکی دارابرد. لەناکاوبەپەلی دارێکی پا نتۆڵەکەی **بەقەڵفەزچو** ودرا. دوایەش بەهەزارحاڵ درویەوە.

بە + قین + دا + چون = **بەقین داچون.** وەك: براکەم لێمان بە

قینداچوەونایەوێ دەگەڵمان ئاشت بێتەوەو هەر خۆشمان تێ ناگەێنێ!

بە + گەرو + ڕۆ + چون = **بەگەرو ڕۆچون**. وەك: نانی تازە نەبێ **بەگەروم ڕۆناچێ**.

بە + گژ + دا + چون = **بەگژداچون**. وەك: هێندێك کەس هەن بە چاکی گوێ بۆقسەی خەڵکی ڕاناگرن وبێ ئەوەی لەمەبەستی قسەیان بگەن، هەرلەخۆرا لێیان وەدەنگ دێن و **بەگژیان دادەچن**. پاشان تێ دەگەن کە جێی **بەگژداچون** نەبووە. جاچ چاکە لەسەرەخۆ بین وبەجوانی گوێ بۆقسەی خەڵکی ڕاگرین ودوای بیستن، لێکی دەینەوەوئەگەرجێی وڵام دانەوەبێ، بەگوێرەی قسەکەوڵام بدەینەوە. هەروەکو پێشینیان کوتویانە: قسەی بگێڕە، ببیبڕە، بیوێژە.

بە + هاوار + ئەوە + چون = **بەهاوارەوەچون**. وەك: زۆر کەسی واهەیەبانگمان دەهێڵن کە دەفریایان بێین. ئێمەش دەبێ زو **بەهاواریانەوە بچین**.

بە + هەڵە + چون = **بەهەڵەچون**. وەك: بێتو لەباتی پێنج، شەش بنوسین پێمان وابێ کە دروستمان نوسیوە، **بەهەڵەچوین**.

بە + هیچ + نە + چون = **بەهیچ نەچون**. وەك: دوژمنی خوێری ئەوەی پێی دەکەی وبەسەری دێنی، ماوەیەك پێی ناچێ کەدەلێی نەبای پێ داهاتوەونەبۆران، دیسان دەس دەکاتەوە بەپیلان گێران و **بەهیچ ناچێ**.

بۆ + لای + کار + چون + ئەوە = **بۆلای کارچونەوە**. وەك: چەند ساڵ لەمەوبەرسەگێکی مەڕی چوبوتێشوی شوانەکەی خواردبو وقرتمی لەنانی بڕیبو. شوانەکەش سەگ بەحەسارێکی پێ کرد. ئیدی ببر ببربۆلای **ئەوکارە نەچۆوە**. وتەمبێ گرتوبو.

بێ + سەر + و + شوێن + چون = **بێ سەروشوێن چون**. وەك: ئەوکابرایە چەندما نگ لەمەوبەر چوبووەسەفەرێ. زۆری پێ چو. خاووخێزانی چەند کەسێکیان بەدوا داناردبەلام هیچ سەروسۆراغێکیان لێ وەدی نەهێنا و **بێ سەرو شوێن چو!**

تاقەت + چون = **تاقەت چون**. وەك:

دەچم بــو پێنجـوێن، پێنجم پێ دەچێ

هــەتـا دێمــەوە، تــاقــەتم دەچێ.

توێخ + چون = **توێخ چون**. وەك: تێی داشل وکوت بوم وئەخت وچارم کرد و **توێخم چو** نەهاتە زوری!

توێخ + و + لوێخ + چون = **توێخ ولوێخ چون**. وەك: تێی دا مردم وسوتام، **وتوێخ ولوێخم چو** دیاری یە کەی لێ وەرنەگرتم. وبەسەری دادامەوە!

چاو + لە + قوڵ + ئەوە + چون = **چاولەقوڵەوەچون**. وەك: چەند ڕۆژێکە کورەکەم زۆرکز بووە وچاوی چووە لە قوڵەوە، هەر دەڵێی نانی نەخواردووە!

چون + ئە + بن + باڵ = **چونەبن باڵ**. وەك: ئەوپیاوە ئەوەندە پیـر بو نەیدەتوانی لەجێی خۆی ڕاست بێتەوە. **چومە بن باڵی** وشانم وە بنەنگڵی داوهەڵم هەستاند.

چون + دە + فکر + ئەوە = **چون دە فکرەوە**. وەك: جاری واهەیە پیاوبەخەیاڵ دەچێتە مەدینێ وبۆی دەڕوا وبیروهۆشی بەسـەر خۆیـەوە نامێنێ **ودەچێ دە فکرەوە**. فکر وخەیاڵ وەك کوتری وان، لە پڕێك هەڵدەفڕن.

چون + لە + دڵ + ئەوە = **چون لە دڵەوە**. وەك: لەودوبیر وباوەڕانە، پترئەوەیانم **دەچێ لەدڵەوە** ودڵم زیاترئاوی لێ دەخواتەوە.

چون + لە + گوێ + ئەوە = **چون لە گوێ وە**. وەك: ئامۆژکاریەکەی کە ئەوێ ڕۆژێ کردمت، **چولە گوێ مەوە** ولەبیری ناکەم.

چون + ئە + حەج = **چونـەحەج**. وەك: کـەسێکی کە **دە چێتـە حەجێ** لەگەڕانەوەی دا، پێیەوە دەچن وپێی شادوشوکردەبنەوە. ئەویش بۆیان دەستە و دوعا دەبێ و دوعا بۆعومر ومالیان دەکا.

چون + ئە + خوار = **چونەخوار**. وەك: وەختێك باران دەبارێ، زوبەهەردی دا **دە چێتەخوار**.

چون + ئە + ڕاو = **چونەڕاو**. وەك: جاروبارخەڵك دە **چنەڕاوێ**: ڕاوی بەراز، ڕاوی ڕێوی، پێشوخەڵك **دەچونە ڕاوی** حەوت شەو وحەوت ڕۆژان.

چون + ئە + ڕێواس + ئان = **چونەڕێواسان**. وەك: مانگی خاکەلێوە یە وخەڵکێکی

زۆر چونە ڕێواسان.

چون + ئە + زگ = **چونەزگ**. وەك: شیرە کەم پاش کولاندن لە سەر ئاورگی داگرتبوە خوارێ وبە جێم هێشتبو، پشیلە یەك چوبووە **زگی**. هەستی لێ بریبو!

چون + ئە + زییارەت = **چونە زییارەت**. وەك: دوێنێ **چومە زییارەتی** مامۆستاکەم، لەخاکی پای کەوتم وبەدڵ سپاسی ئەرکە کانیم کرد.

چون + ئە + ژوان = **چونە ژوان**. وەك: ئەوکچ وکورەی کە یەکتریان خۆش دەوێ وحەزلێك دەکەن، جاروبارلە جێیەکی دیاری کراوبەیەکتری دەگەن و بۆیە کتر دە **چنە ژوانێ** وبۆ بەیەکتر بران، وت و وێژدە کەن.

چون + ئە + ژێر + بار = **چونەژێربار**. وەك: ئێمە نابێ بەهیچ جورێك **بچینە ژێرباری** چاکەی خەڵکی وچاوبەرە ژێر یان بین. دە نا، ڕۆژێکی دێ کە بەچاومان دابدە نەوە ومنەت باریان بین!

چون + ئە + سەر + تەخت = **چونەسەرتەخت**. وەك: نازانم ئەو پاشایە لەچ ساڵێکدا پاشایەتی دەست پێ کردووە و **چووەتەسەر تەخت**.

چون + ئە + سەر + چاکی = **چونەسەرچاکی**. وەك: چەندرۆژ پێش چەندکەسێك چونەسەروەیس دەستیان بەسەر گڵکۆکەی داهێنا ولە خودای پارانەوە کە ئاواتیان وەدی بێنێ ولەوێش ڕا**چونەسەر چاکێکی** دی.

چون + ئە + سەر + ماڵ = **چونەسەرماڵ**. وەك: ئەوکورە ژنی هێناوە. بابی ژنەکەی پێی کوتووە: ڕۆڵە گیان، لەبەرئەوەی کە پیرم وکەس نییە بەماڵ ودوکانە کەم ڕابگا، لەگەڵ کچەکەم وەرنە لای من با بە یەکماڵی بژین. کورەکە بە زاوابەندی **چووەتە سەر ماڵێ**.

چون + ئە + سەفەر = **چونەسەفەر**. وەك:

گوڵ نیشان هەی گوڵ نیشان، ئەسمەر حاڵم پەرێشان
یارم چووەتە سەفەر ێ، دەسماڵی بۆمن نیشان.

چون + ئە + سەیر = **چونەسەیر**. وەك: لەمێژبو بەگەل نەچوبوینە دەرێ. دوینێ نان وچێشتێکی زۆرمان هەڵگرت و بوسەیر چوینە باغی ولە سبحەینەرا

هه‌تائێوارێ به‌خۆشی رامان بوارد.

چون + ئه‌ + شه‌را + یی + مه‌رگ = **چونه‌ شه‌رای مه‌رگ**. وه‌ك: وه‌ختێك ژانه‌ که‌له‌ پشتم‌ده‌وه‌ستێ، **ده‌چمه‌ شه‌رای مه‌رگ‌وه‌**!

چون + ئه‌ + که‌نگر + ئان = **چونه‌ که‌نگران**. وه‌ك: خه‌ڵکێکی زۆر به‌ پیشك و بێڵه‌کانی و مه‌ساسه‌وه‌ **چونه‌ که‌نگران** له‌ نێو هۆ و بوره‌ و په‌رێزانه‌دا.

چون + ئه‌ + گه‌ران = **چونه‌ گه‌ران**. وه‌ك: چومه‌ماڵی هاواڵه‌کانم بۆ دیده‌نی. له‌ماڵ نه‌بون. بۆم‌ده‌رکه‌وت که‌ ویکرا **چونه‌ گه‌رانێ** و تادره‌نگانێك نایه‌نه‌وه‌. من چاوه‌ڕوانیم کردن، تاکوهاتنه‌وه‌.

چون + ئه‌ + ماڵ = **چونه‌ ماڵ**. وه‌ك: پیاو وه‌ختێك ده‌ **چێته‌ ماڵه‌** خه‌ڵکی، ده‌بێ چاوه‌ڕوانی ئه‌وه‌ش ببێ که‌ خه‌ڵکیش بچنه‌ماڵی. ماڵیش به‌ هات و چۆ وه‌ خۆشه‌. بێتو مێردومیوان وخزم‌وکه‌س وئاشناورۆشنا روی تێ نه‌که‌ن، هه‌ر بۆ تێدادانیشتنێ نابێ.

چون + ئه‌وه‌ + سه‌ر + هه‌وار + ئی + خاڵی = **چونه‌وه‌ سه‌رهه‌واری خاڵی**. وه‌ك: چوبوین بۆشاری وکه‌سمان له‌ ماڵێ به‌ جێ نه‌ هێشتبو. وه‌ختێك که‌ گه‌راینه‌وه‌، چ بگه‌رێینه‌وه‌؟ گه‌سکیان بۆره‌ماڵێ خستبوین وبزگۆرێکیان بۆنه‌هێشتبوینه‌وه‌ وبه‌و جوره‌ **چوینه‌وه‌ سه‌رهه‌واری خاڵی**.

چون + ئه‌وه‌ + ماڵ = **چونه‌وه‌ ماڵ**. وه‌ك: وه‌ختێك پیاوده‌چێته‌وه‌ ماڵێ وده‌ بینێ میوانی هه‌یه‌، شایی له‌دڵی داده‌ گه‌رێ وگه‌زگه‌زێیی بالاده‌ کاوله‌خۆشیان به‌میوانه‌ که‌ی ده‌ڵێ: یاخودا به‌ خێرێ ی، دا رپیرده‌ بێ، جارێك باز له‌ سه‌ری‌ده‌ نیشێ.

دڵ + تێ + چون = **دڵ تێ چون**. وه‌ك: جاری واهه‌یه‌، پیا ودڵی به‌ شتێکه‌وه‌ یه‌ وپێ ی خۆشه‌هه‌ یبێ وچاوی تێ ده‌ برێ وبۆی ده‌ چێ ده‌ فکره‌وه‌. ئه‌و**دڵ تێ چونه‌** پیا وبه‌ ده‌ست خۆی نییه‌.

ده‌ + نێو + ئه‌وه‌ + چون = **ده‌ نێوه‌چون**. وه‌ك: کاتێك سه‌رده‌می منداڵی و هه‌رزه‌ کاری به‌ سه‌رده‌چێ وهه‌ره‌تی لاوی ده‌ روا، هێزوگوری پیاوله‌ که‌ مێ ده‌داو **ده‌نیوه‌ده‌چێ**. ئه‌وجارسه‌ری سپی ده‌بێ وحوکمی چاوی نامێنێ وددانه‌کانی ده‌که‌ون و پیر وزورهان ده‌بێ!

رزق + چون + ئه + سەر + پشتی + کەر = **رزق چونە سەر پشتی کەر**. وەك: یەك بە یەکێ دەڵێ یاخودا بژیوی تۆ بچێتە سەر پشتی کەرێ وئە تۆ پیادە بی وئە و سوار، هەر بڕۆی و نەیگە یەی!

روح + دەر + چون = **روح دەرچون**. وەك: بابی ئەوکابرایە ی هێشتا لە نان خواردن نە بو بۆوە کە **روحی دەرچوو** مرد! خودالێی خۆش بێ.

رەنج + بە + با + چون = **رەنج بە باچون**. وەك: چەند ساڵێك بو خەریکی کۆکردنەوەی بەیتان بوم و گەلێکیانم خڕ کردبونەوە. بەڵام بەداخەوە سەرپاکیانم لێ ون بون و **رەنجم بە باچو**!

رەنگ + چون = **رەنگ چون**. وەك: هێندێك مافورە هەن کە زوکاڵ دە بنەوە و **رەنگیان دەچێ**. بەڵام بێتوکریان خۆ رەنگ بێ **رەنگیان ناچێ**.

رێ + بۆ + چون = **رێ بۆچون**. وەك: بەدڵنیاییەوە ناکرێ بڵێم بۆچی نەهاتوە، رەنگە نەخۆش کەوتبێ، **رێشی بۆدەچێ** بە سەفەر چوبێ.

رێ + تێ + چون = **رێ تێ چون**. وەك: بەوقەرا روبریەی بۆخۆی داییناوە، **رێی تێ دەچێ** بەوزوانە بگەڕێتەوە. جامە گەرهیچ دەرفەتی نەبێ.

زراو + چون = **زراو چون**. وەك: رۆژی تۆڵە ئەستاندن، وەختێك زۆردار، زۆر لێ کراوی خۆی دەبینێ، قەڵەمی دەست وپێی دەشکێ و **زراوی دەچێ**. دە بائەوەی چاندویەتی، هەڵی گرێتەوە.

زگ + چون = **زگ چون**. وەك: پاش نیوەرۆیە ژانێکم لە زگی وەستابو. ژان وپێچی وەهای پێدادەهات هەردە تکوت ئەوا مردم، کارم پێ نەدەکراو برستی لێ بڕیبوم. پێم وایە **زگ چونم** پێوە نوسابو.

زەندەق + چون = **زەندەق چون**. وەك: دنیاهەرواهاتووەووارۆیوە، خراپ لە چاك ترساوە وناشیرن لە جوان **زەندەقی چووە**.

سپی + چون + ئەوە = **سپی چونەوە**. وەك: هاوینان لەهێندێك کۆیستانان، بەفرناچێتەوەو رەشا نگیان تێ ناکەوێ ولە دور راهەر **سپی دەچنەوە**.

سوێ + چون = **سوێ چون**. وەك: کاتێك بە منداڵێکی بەڵێنی خواردەمەنێکی دەدەین، تادەیدەینێ، وەختە **سوێ ی بچێ**.

سور + چون + ئەوە = سورچونەوە. وەك: بەهاران لە کویستانان، لە جێی زەمەندوزِە نوێر وبژوێن، گوڵەمێلاقەولاتی دادەگرێ وتاچاوهەتەرێ دەکاولات سوردەچێتەوە. جێی لێ نەبێ لەگوێن بە هەشت دەخەملێ.

سەر + بە + هەنیسك + ئان + ئەوە + چون = سەربەهەنیسکانەوە چون. وەك: وەختێك منداڵ لە گرو رادەچێ، دەبێ بیلاوێنینەوە وژیری کەینەوە، دەنا ـ خودابەوێ رۆژێ نەکا ـ سەری بەهەنیسکانەوە دەچێ و گەشکەی دەگرێ.

سەر + تێ + دا + چون = سەرتێداچون. وەك: دیتم میوانەکانم هەرنەهاتنەوە ماڵێ. کورەکەی خۆمم وەدواخستن، تاکو بیان بینێتەوە وبیا نهێنێتەوە ماڵێ. کەچی ئەویش بێ سەروشوێن چو وەهەرنەها تەوەو سەری تێداچو! یان: براکەی لە شەرێ داکوژرا! بۆخۆی چوکە تۆڵەی بستێنێتەوە بەلام ئەویش سەری لەسەرئەو رێەێ داناو سەری تێداچو!

سەر + لێ + دەر + چون = سەرلێ دەرچون. وەك: وەختێك شتێك تێك دەچێ، ئی واهەیەدەستی تێوەردەداوهیچیشی لێ نازانێ لەبەرئەوەی کە سەری لێ دەرناچێ، پەکی دەخاوئادا ری لەسەرپاداری ناهێڵێ!

سەر + ئە + خۆشی + چون = سەرەخۆشی چون. وەك: کاتێك یەکێك مردوی لێ دەمرێ سەرەخۆشی کەر دەچنەماڵێ، یان دەچنەمزگەوت. پاش فاتیحە خویندن سەرەخۆشی لێ دەکەن. خاوەن مردووە کە بەوکارەی تەمی خەم لەسەری لادەچێ و دڵی دەکرێتەوە. سەرەخۆشی چون بەدەردومەرگی خەڵکیەوە بونە.

شك + بۆ + چون = شك بۆچون. وەك: پێت وایە نوسەری ئەو کتێبەی کێیە؟ شکت بۆکێ دەچێ؟

شك + ئی + تێ + دە + چێ = شکی تێ دەچێ. وەك: بۆی هەیە وشکی تێ دەچێ ئەورۆ باران بباریَ.

قسە + بە + گوێ + دانە + چون = قسەبەگوێ دانەچون. وەك: ئەوکابرایە ئەوەندەی پێ‌ی دەڵێن ورێنوێنی دەکەن، قسەی کەسی بە گوێ داناچێ. یان: ئەوقسەم بە گوێ داناچێ، ئەوما مۆستایە زۆر لەسەرەخۆ وبەتێرادیوی دەرسێ

ده ڵێ.

قه‌ره + به + قه‌ره + چو ن = **قه‌ره به قه‌ره چون**. وه‌ك: دزه كه‌م له گیر خستبو، زۆری پێ نه‌چو خۆی له‌ده‌ستی‌را پسكـاندم‌و خـۆی لێ شاردمـه‌وه. به‌ڵام خوداوڕاستان، له‌دور ڕاچاوم پێی كه‌وته‌وه‌ ووه‌دوای كه‌وتم و **قه‌ره به‌قه‌ره‌ی چوم** وله گیرم خسته‌وه.

قیمه‌ت + چون + ئه + سه‌ر = **قیمه‌ت چونـه‌سه‌ر**. وه‌ك: چـه‌ندسـاڵ له‌مه‌وبه‌رشتومه‌كت زۆربه هه‌رزان ده‌كری؛ به‌ڵام ئێستێكه **قیمه‌تی هه‌مو شتێك چۆته‌سه‌رێ** وشتی واهه‌یه كه‌هه‌رله كڕین نایه. نه‌خوازه، له شتی به‌وه‌زن سوك و به قیمه‌ت گران.

گیان + ده‌ر + چو ن = **گیان ده‌رچون**. ئه‌وه‌ی گیان له‌به‌ر بێ وه‌ختێك دێ كه **گیانی ده‌ر ده‌چێ** ودێته‌ڕیزی مردووان! یان: ئه‌وه نده لاوازه، كه‌پۆی بگری، **گیانی ده‌رده‌چێ**!

له + به‌ره + گه + چو ن = **له‌به‌ره‌ گه‌چون**. وه‌ك: وه‌ختێك له ڕێگای ژیان‌دا دوسێ جـارتێـك شكـاین‌و زه‌ بـرمـان ڕێكـه‌وت، نـابێ لـه بـاربكـه‌وین‌و **له‌به‌ره‌ گه‌بچین** و جێ بۆ دوژمن خۆش كه‌ین.

له + بیر + چو ن = **له بیرچون**. وه‌ك: چێشته كه‌م له‌سه‌رئاورگی داناوئاورم لێ خۆش كرد. پاشان چومه‌ده‌رێ وچێشته‌كه‌م **له‌بیرچووه**، دوای دره‌نگانێكی كه‌گه‌ڕامه‌وه، بۆچروك له ماڵێ گه‌ڕابو و چێشتیش ببوه خه‌ڵوز!

له + بیر + و + هۆش + ئه‌وه + چو ن = **له‌بیروهۆشه‌وه چون**. وه‌ك: وه نه‌وزم‌ده‌دا و تازه چاوم گه‌رم كردبو وده‌هات خه‌وم لێ بكه‌وێ و **له‌بیروهۆشه‌وه بچم** كه، له ده‌ركێیان‌دا.

له + جێ + چو ن = **له‌جێ چون**. وه‌ك: له پلیكانان به‌ربومه‌وه وده‌ستم ئێشێكی وه‌ها ی تێ وه‌ستاكه‌كاری پێ نه‌ده‌كرا. دیتم **له جێ چووه**!

له + چاو + چو ن = **له‌چاوچون**. وه‌ك: ئه‌وگۆرانی بێژه ئه‌وه نده به‌ناوبانگ بو كه له‌هه‌رجێ یه‌ك باس باسی ئه‌وبو. ماوه یه‌ك بو گۆرانی بێژه كانی دیكه زۆری لێ ده‌دوان وپێی هـه‌ڵده‌كـاڵان! چاووزاركـاری لێ كـردا! ئـه‌وجـارده‌نگی

نوساونوزەی لێ نەدەهات ولەچا وچو! بەڵام من پێم وایە لە چاوچون بۆی نییە.

لە + خرتك + چون = **لە خرتك چون**. وەك: ماڵمان دەگوێستەوە. لەوەختی بارداگرتن وبا رهەڵێنان دا پێ یەکم لەگرێچودا زەبری پێ گەیشت. زانیم کە **لە خرتك چووە!**

لە + دڵ + دەر + چون = **لەدڵ دەر چون**. وەك: ئەوقسەسوك و ناشیرن وکاڵانەی کەتۆلە پارسەنگمت نا، قەت **لە دڵم دەرناچێ** و وەکو ناسۆرێکە لەسەردڵم! یان:

دەنگم نوسا وەبە گوڵەبەرۆژە    لەدڵم دەرناچێ قسەی ئەورۆژە.

لە + دوا + چون = **لەدواچون**. وەك: چەندکەسێکیان بۆشاییە بانگ کردووە، ئەوانیش دێن بۆسەرشاییە. بەڵام لەبەرئەوەی **لەدوای وی نەچون**، رەنگە نەیە.

لە + دەس (دەست) + چون = **لە دەس چون**. وەك: لە ساڵی گرانی دا، ئەومەروماڵاتێکی کەهەمبو، پاکیانم **لە دەس چون** بەڵام خەمم بۆدانە گرتن، هەرسەرسلامەت بێ.

لە + دەم + دەر + چون = **لەدەم دەرچون**. وەك: قوتابێکم هەیە، هێشتانیوەی مەبەستم **لە دەم دەرنەچووە**، نیوەکەی دیکەی دەڵێ.

لە + دین + دەر + چون = **لەدین دەرچون**. وەك: رق هەڵستان شتێکی زۆرخراپە، ئی واهەیە وەختێك قەڵس دەبێ هێندەی نامێنێ فەراق بکاو **لەدین دەربچێ!**

لە + رو + چون = **لەروچون**. وەك: هێندێك کەس هەن پێ کراوورودا ماڵاون و بەهیچ ناچن و **لە رو ناچن!**

لە + رێسمە + چون = **لە رێسمە چون**. وەك: ئەودەرکە ئەوەندە کۆن بوە کەکەڵکی نەماوە، هێندەی نەماوە کە چوارچێوە کەشی بێتەدەر، لەبەرئەوەی **لە رێسمە چووە.**

لە + غەزەب (غَضَب) + را + چون = **لەغەزەب راچون**. وەك: ئی واهەیە زۆربەرتەنگ و قەڵس ورق ئەستورەو وەختێك رقی هەستا و **لەغەزەب راچو**، زورقی نانیشێتەوە!

له + کوت + و + تاس + ئه‌وه + چو ن = **له کوت وتاسه‌وه چون**. وه ك: هێندێك منداڵی به‌رمه‌مکان هه‌ن که به‌زه‌بره‌وه ده گر ین وهه نیسکان ده‌ده‌ن وشین ورەش هه‌ڵده گه‌رێن و **له کوت وتاسه‌وه ده‌چن**!

له + کیس + چو ن = **له کیس چون**. وه ك: زۆرجارپیا و ده‌رفه‌تی وه‌ی هه‌یه له‌گه‌ڵ ما مۆستا یه‌کی بلیمه‌ت وهه ڵکه‌وتو، قسان بکا وزۆرشتی لێ بپرسێته‌وه، به‌ڵام له‌وده‌رفه‌ته‌ی که‌ڵك وه‌رناگیرێ و مامۆستا مان لێ دورده بێته‌وه وئیدی ده‌ستمان پێی راناگاو هه‌له به‌نرخه‌که‌مان، **له کیس ده‌چێ**.

له + گرێژه‌نه + چو ن = **له گرێژه‌نه چون**. وه ك: ئێمه له‌ماڵ نه‌بو ین، میوان هاتون ووایان زانیوه له ماڵین. زۆریان له‌ده‌رکه‌ی داوه. ئه‌وه‌نده یان لێ داوه که لاشیپانه‌ی خراپ بو وه و **له گرێژه‌نه‌چووه**! هه‌ربه‌فو یکی به‌نده!

له + گر و + را + چو ن = **له گرو راچون**. وه ك: وه ختێك منداڵ په‌ڵپ وبیانو ی گرت وگریاوکه‌س نه‌بو بی لاوێنێته‌وه و ژیری کاته‌وه و ده‌ربه‌ستی بێ، **له گروراده‌چێ** و واهه‌یه گه‌شکه‌ی بگرێ!

له + مه‌یدان + چو ن + ئه + ده‌ر = **له مه‌یدان چونه‌ده‌ر**. وه ك: ژیان مه‌یدانه، هه‌رکه‌سێك به‌گوێره‌ی هێزی خۆی، به‌ناسه‌رسه‌نگیش ده‌بێ چه‌ند رۆژێکی بارته‌قای ته‌مه‌نی، ئه‌سپی تێدا لینگ بداوته‌قڵه‌ورمبا زی بکا. ئیدی له‌ومه‌یدانه‌ی **نه چێته ده‌رێ** ده نابه خوێری ده ناسرێ!

ما وه‌یه‌ك + پێ + چو ن = **ماوه‌یه‌ك پێ چون**. وه ك: بۆدیتنه وه‌ی ما نای ئه‌ووشه یه چه‌ندقا موسێکم لێك دان، **ماوه‌یه‌کی زۆری پێ نه‌چو** خوداوراستان، مانا که‌م له‌قاموسی زمانی کوردی به‌رهه‌می ما مۆستازه‌بیحی دا دیته‌وه، که ماناکه‌پر به پێستی بو ودڵم ئاوی لێ خوارده وه.

مایه + تێ + چو ن = **مایه تێ چون**. وه ك: چه‌ڵپێکی دی ئاوبه دم وچاوت داکه، ئاوه که خۆرایی یه‌و **مایه‌ی تێ نه چووه**.

مو + ده + به‌ر + ئه‌وه + چو ن = **موده‌به‌ره‌وه چون**. وه ك: له‌وده‌میه‌وه که ئاشت بو ینه‌وه، ئه‌وه‌نده پێکه‌وه جوتین و نێوانمان خۆشه که **مومان ده‌به‌ره‌وه ناچێ**.

مێشك + ئی + سەر + چون = **مێشکی سەرچون**. وەك: وە ختێك منداڵ لە گوروراده چێ وژێر نابێتەوە، پیا ومێشکی سەری دەچێ! یان: ئی واهەیە ئەوەندە زۆربڵێ یە سێ گرمەکی قسان دەکا وخەڵکی بێ وازدەکاو وایان لێ دەکاکە پێی بڵێن: دەبەسە مردوت مرێ. زۆرکوتن قورئان خۆشە، **مێشکی سەرمان چو!**

نێو + دەر + چون = **نێودەرچون**. وەك: کە سێك نێوی بە چاکەیان خراپە دەرچێ، نێو بانگی هەربەوەی دەرواوخەڵك بەوجورەی دەناسن.

وا + وە + چون = **واوە چون**. وەك: تکایە نەختێك هەڵگەرێ بۆ سەرێیان داگەرێ بۆ خوارێ و واوەچۆ (بچو) هەتا برۆم.

وێ + وە + چون = **وێ وە چون**. وەك: تکایە کەمێك جێم بۆ چۆل کەووێوەچۆ (بچو) هەتا برۆم.

هات + و + چو + کردن = **هات وچو کردن**. وەك: بە بەرئەودوکانەدا هێندە مەیەومەچو، ئەو هەمو **هات و چویەت** لە چییە؟

هەترەش + چون = **هەترەش چون**. وەك: وە ختێك مشك، پشیلەی دەبینێ، لە ترسان **هەترەشی دەچێ!**

بە + قور + ئێ + دا + چون = **بە قورێدا چون**. وەك: قەرەچی، **بە قورێدا چی، قەت دەرنە چی!**

داخ + چون = **داخ چون**. وەك: نوسراوەیەکم گەلاڵە کردبو، بۆ دەرخستن و بڵاوکردنەوە. داخم ناچێ، لێم ون بو!

سۆما + ئی + چاو + چون = **سۆمای چاوچون**. وەك: ئەوەندە چاووچرم بەسەر گۆڤاران دا گرتووە، کە سۆمای چاوم چووە!

شەیتان + چون + دە + کەڵیشە + یە + وە = **شەیتان چون دە کەڵیشەیەوە**. وەك: قەڵسە، تا ماوەیەك **شەیتان چووەدە کەڵیشەیەوە!**

بە + مێرد + چون = **بە مێرد چون**. وەك: دوێنێ کچێك لە گەرەکی ئێمە **بەمێرد چو** و بردیانە ماڵە مێردی.

بە + رەحمەت + چون = **بە رەحمەت چون**. وەك: بابم لە مێژە بە رەحمەتی خودای چووە.

له + خێر + و + بیر + چون + ئه + ده ر = له خێر و بیر چونه ده ر. وه ك: ئه وامن ده ستم له و پول و پاره ی هه ڵگرت و له خێر و بیری چومه ده ر.

چون + ئه + خزمه ت = چونه خزمه ت. وه ك: دوێنێ چومه خزمه ت ماموستاکه م.

گۆڕ + به + گۆڕ + چون = گۆڕبه گۆڕ چون. وه ك: دوژمن مرد و گۆڕ به گۆڕ چو! و جه نده کیان له بودرێکی دا شارده وه!

به + بوك + چون = به بوك چون. وه ك: ئه و شۆره کچه جوانه یان دوێنێ گوێسته وه و به بوك چو، به ڕوسوری بۆ ماڵی مێردی.

ساڵی + به + هه زاری + چو + بێ = ساڵی به هه زاری چوبێ. وه ك: دوژمن زۆری لێ کردوم! به ڵام به سه رێوه نه چێ، ساڵی به هه زاری چوبێ تۆڵه ی خۆمی هه ر لێ ده که مه وه و لێکی ده ر ده که ین.

به + تالان + چون = به تالان چون. وه ك: دوژمن نامه ردانه و بێ به زه یی ده ستی به ماڵه که م داهێنا وئه وی وه به رده ستی هات، هه ڵیگرت و به وجوره ی ئه وی هه مبو و نه مبو به تالان چو!

به + خێر + چون = به خێر چون. وه ك: بێتو بته وێ ئه من به جێ بهێڵی و بڕوێیه وه بۆ ماڵێ، خودات له گه ڵ بێ و به خێر چی!

حه وسه له + به + سه ر + چون = حه وسه له به سه ر چون. وه ك: جاری واهه یه پیاو داده هێزێ و حه وسه له ی به سه ر ده چێ و وازی نیه هیچ کارێکی بکا!

له + سه ر + لا + چون = له سه ر لاچون. وه ك: برینه که پێوه چو وه و پێستی له سه ر لاچوه! ده بێ هه توان و شه ڵته ی له سه ر دانێین.

له + به ر + پێ + ئان + دا + چون = له به ر پێیان دا چون. وه ك: وه ختێك حه شیمه تێکی زۆر خۆیان له جێیه کی ده ربازده که ن و به ره وجێیه کی دی هه ڵدێن، له وانه یه منداڵی ساوا له به ر پێیا ندا بچێ و بفلیقێته وه!

له + گژ + را + چون = له گژرا چون. وه ك: دوژمن پری پێداگرتم ومنیش تاکو بۆم کرا، لێی نه پرینگامه وه و له گژی را چوم.

دڵ + بۆ + چون = دڵ بۆچون. وه ك: ئه و کتێبه ت کریوه که بیفرۆشیوه، دڵم

بۆی ناچێ و پێم وا نییە کە قازانجی لێ بکەی.

لە + خەو + را + چون = **لە خەو را چون**. وەك: پیاو لە پێش ئەوەی دا کە لە غور رابی خەوێ راچێ، چاوی لە سەر یەك دا دەنێ و لە بیر و هۆشەوە دەچێ.

لە + بیر + و + هۆش + ئەوە + چون = **لە بیر و هۆشەوە چون**. وەك: وەختێك پیاو بە چاکی خەوی لێ نەکەوتوە، **لە بیر و هۆشەوە دەچێ**.

چاو + لە + رەش + ئەوە + چون = چاو لە رەشەوە چون. وەك: زۆرجار کە پیاو لە بڵیندیکەوە چاو دەروانێ، **چاوی لە رەشەوە دەچێ** و چاوی رێشکەوپێشکەی دەکا.

بە + هیچ + ئێ + چون = **بە هیچێ چون**. وەك: کورە کە نەخوش کەوتبو وپێش ئەوەی دوکتور ببیینێ گیانی دەرچو! **بەداخەوە بە هیچێ چو**!

ترس + چون = **ترس چون**. وەك: واهەیە پیاو سامی رێ دەکەوێ و لە شتێکی دەترسێ. بەڵام پاش ماوەیەکی سامی دەشکێ و**ترسی دەچێ**.

وەخت + چون = **وەخت چون**. وەك: ئەورۆ بەخـۆرایی، زۆر وەختم چو. بێتو قەدری وەختم زانیبا، ئەوەندەم **وەخت نەدەچو**.

چون + لە + کەللە + وە = **چون لە کەللەوە**. وەك: کاتێك پیاو شتێکی لێ حاڵی دەبێ، **دەچێتە کەللەیەوە** وزۆردرەنگ لە بیری دەچێتەوە.

چون + ئەوە + سەر + کار + ئی + خراپ = **چونەوە سەر کاری خراپ**. وەك: بۆیە پەندی بـەسەر دەهێنین، تـاکو بیـر ببڕ **نـەچێتەوە سـەر کاری خـراپ** وخەڵکیشی پێ چاوترسێن کەین.

چون + دە + فکر + ئەوە = **چون دە فکرەوە**. وەك: کاتێك بیر لە شتێکی دەکەینەوە ودەمانەوێ وە بیر خۆمانی بهێنینەوە، **دەچین دە فکرەوە**.

بە + دز + دەر + چون = بەدزدەرچون. وەك: کابرای کەخۆی بە پیا وچاك دەناساندوخەڵکی باوەڕیان پێ دەکرد، **بەدز دەرچو**!

چاو + زیت + چون + ئەوە = **چاو زیت چونەوە**. وەك: لە تاریکایی شەوێ داکابرای دز خۆی لە کەلێنێکی ماڵەکەدا شاردبۆوە و حاشاردابو و**چاوی هەر زیت دەچۆوە**.

له + نویژ + چون = **له نویژچون**. وەك: پیاوبەزۆرشتان لە نویژدەچێ ودە بێ سەرلە نوێ دەس نویژ هەلگریتەوە.

له + قسه + دەر + چون = **لە قسە دە رچون**. وەك: بە منت كوت چاك بخوێنم. بەداخەوە بە قسەم نەكردی وزیانم كرد. ئەوجار لە قسەت دەر ناچم.

چون + ئە + پشت + ئی + شێر + ئان = **چونە پشتی شێران**. وەك: جاری واهەیە شتێك پەیدانابێ وبە هیچ پولێكی وەدەست ناكەوێ. بەلام جار جا ریش شتە كەزۆر بە گرانی وەدەست دەكەوێ ودە **چێتە پشتی شێران**.

دڵ + لە + خێڵ + ئەوە + چون = **دڵ لە خێڵەوە چون**. وەك: ئەوە ندەم برسی بو، ئاوم لەدڵی دەهات ودڵم لەخێڵەوە دەچو!

بۆن + بۆ + چون = **بۆن بۆچون**. وەك: كەمیك لەوچێشتەی بەزاری ئەو كورەی دابكە، بۆنی بۆچووە، نەكائەستوربێ.

دە + بور + ئەوە + چون = **دەبورە وەچون**. وەك: ئەوكورە بە بۆنی دوكەڵێ دلی دەبورەوەچووە، پێی رابگەن.

بە + حەوا + دا + چون = **بەحەواداچون**. وەك: بۆچە قۆیە كی بە حەوادا دەچم. نیمەووەدەستم ناكەوێ. بەن برم ددانە.

# چون، له پاڵ قسەی پێشینیان دا

کۆسە چو بۆ ردێنی، سمێلیشی لە سەر دانا.
رۆژدە چێ و قەزا (قضا) ناچێ.
هەرکەس هەنگا وێکت بۆلا نەیە، دوهەنگاوی بۆلا مەچو.
چون بە خۆتەو هاتنەوە بە خودایە.
کەر بچێتە بە غدایە، نابێتە یە ستر.
لە دوای چوان، مە چو.
دە یانکوت: پشیلە گوت بەدەرمان دە شێ، دە چو دە ی شاردەوە.
ئاو بە ئاوەدانێ دا دە چێتەخوار.
سەرمان بچێ، نوێژمان ناچێ.
ئەوە ی دە چێتە باڵ ماڵان، یاخوداکافری بێ بە حاڵان.
ئەوانەی دە چنە باڵ ماڵان، یا خوداکافریان بن بە حاڵان.
لە بەربای مەکێشەتوتنێ، لەهەورازان مەلێ کوتنێ، مەچووە سەرماڵی بابی ژنێ.
هەمو رێیەك دە چێتەوە بۆ با نە.
گاران بە خرێکە وە دە چو، لە مانگای پیرێژنیان دە پرسی.
لە هەرشتێکی بترسی هەر بەوی دە چی!
بەئاودا چو، بە عەرزی داخورا.
وەك بەفری پار چو.
پیس بە پیسێ دە چێ.

ماڵی حەرام بەگەروی کەس ڕۆ ناچێ.
بەلاباران، پیاو ناچێتە هەواران.
ئەوەی بچێتە ڕاوە ماسیان، قونی تەڕ دەبێ.
نە مارلە بیری دەچێ کلك، نەباغەوان کوڕ.
وەختێك بەبنەوبنەچەکەی کەسێکی دابچی یەخواریێ یا بەدۆست دەردەچێ یان بە دوژمن.
بچوبۆشارێك کەس نەتناسێ، خۆت هەڵکێشە پڕ بە کراسێ.
لە ئاشی زۆری پێ دەچێ، لە ڕێگایە پەلەی دەکا.
ڕێوی بۆخۆی لە کونیوە نەدەچو، قانگەلاشکیشی ڕەگەڵ خۆی دەخست.
هەشتی پاك ونۆی پیس، هەمویان چون لە کیس!
بەمانگ بچو میوان بە، بە ساڵ بچو سوڵتان بە.
لە قانگەلاشکیان پرسی، بۆ کویێ دەچی؟ کوتی: با دەزانێ.
لە گوێدرێژیان پرسی، بۆ کویێ دەچی؟ کوتی: شەپ دەزانێ.
سورتدی، سەمات لە بیر چۆوە.
لە بەر خاتری خاتران، دەچمە سەر دینی کافران.
لە کۆلێ دەرچوین، کە وتینە زنجیری.

# چون، لە پاڵ گۆرانیان دا

دەچمە سەرکانێ مرادان، شەرعی خۆم دەکەم تەواوە.
ئەوساڵ حەوت ساڵە عەزیزم، عاشقم بە گوڵێکی دەساوە (ساوا).

★

دەچمە سەرنا لەشکێنێ، بەرا مبەربە بوکانێ.
یاری من زێدە جوانە، باریکەونە شمیلا نێ.

★★

دەچمە سەری سوڵتانی سێ رۆژان نایەمەوە،
دەس (دەست) لە کێلان وەردێنم، چل دانەی دەگرمەوە،

★★★

بەختی خۆمولێو ئاڵێ، بە تاقی دەکەمەوە.
ئەسمەران، دلبەران، دە با بچین بۆگوڵ چنین،

★★★

یاری من لەگەری دایە، بە قورئانی سەرپەرشین،
لە خودای دەپارێمەوە، خوزگە بۆیەکتر بژین.

★★★

گوڵ نیشان هەی گوڵ نیشان ئەسمەرحاڵم پەرێشان،
یارم چۆتە سەفەرێ دەسماڵی بۆمن نیشان.

هەروایە، هەروایە، پەنجەرەی روی لە بایە،
یارم چووتە سەفەرێ، ئاگات لێی بێ خودایە.

★★★

دەنگم نوساوە بە گوڵە بە ڕۆژە،
لە دڵم دەرناچێ، قسەی ئەو ڕۆژە.

★★★

سوێندم خواردووە نەچمە حەجێ        حەجم بۆ بێتە کن لەجێ
تا ماچ نەکەم خاڵی خەجێ!
ئەوشەونەبوشەوێ دینێ        بە خەیاڵ چومە مەدینێ
خزمەت پەری زادەی چینێ.

★★★

وەرە ماڵە کەم قەت قەت مەچۆوە
خەمی سەدساڵەم لە بیر بەرەوە.

★★★

پێم لێ نێ، پێم نێ مەنێ، زەردە لە بەرکولێنێ
دەستم لەنێودەستی نێ، با بچین بۆلای گەرمێنێ

★★★

بۆت دێنم بۆت دێنم، بۆت دێنم لەو مورسایە،
ئەگەرئێران لێی نەبێ، بۆت دەچمە ئورروپایە.

★★★

ماڵم لێرە باردەکا، دەچمە داروبێداری
هەرکەس ئەتۆی لەمن کرد، یاخودا بەردی لێ باری.

★★★

باران بارانە سەحرا (صَحرا)ی کرد رەنگین،
یارخوداحافیز (حافظ) بە دڵێکی غەمگین،

کافرەی پێ نەزان بۆت دەرچوم لە دین،
کوبڕای (کُبرای) خاڵ نەخشین.

★★★

بۆبازرگانی دەچمە شنۆیە،
کراست بۆ دێنم لەگوڵی هێرۆیە.

★★★

هەرکەسێ دەی کا مەنعی من و تۆ،
لەماڵی دەرچێ ڕۆژێ هەشت‌ونۆ.

★★★

سەرکەسەنیرم، تیر بکەشینم
دەچمە ئیجباری، مەرگت نەبینم.

★★★

کۆشکێکت بۆدروست کەم لە بنەی سەهەندی،
دەچمەسەرماڵێی بەزاوا بەندی.

★★★

دەچمەسەرکێوی ئاتێ، دێنم ئاوی حەیاتێ،
دەیدەم بەوپیرەپیاوەی، چاوکەژاڵم بداتێ.

★★★

## چون، لەگەڵ قسەی نەستەقی منداڵان

دومدوم هەللاجی، چوینە ماڵی مام حاجی، مام حاجی لە ماڵ نە بو، هێلکەورۆنی لێ نابو، بەشی مەشی نە دابو.

نیسێ کە! ،بچۆوە، کورە کەچەڵە کەت دە گری.

تاوە کە! وەرەوە ،وەرەوە، کچە زێرینە کەت دە گری.

دەچمە ماڵە جولەکە، قوڵتە قوڵتی کولەکە، دەچمە ماڵە ئەرمەنی، قوڵتە قوڵتی سەمەنی، دەچمە ماڵە موسوڵمان، دەنگی یاسین و قورئان.

قامکی چکۆڵە بە قامکەکانی دی دەڵێ: بچین بچین. قامکی تەنیشتێ دەڵێ: بۆکوێ بچین؟ ئەوی دی دەڵێ: بچین بۆدزی. ئەوی دی دەڵێ: لە خودای نە ترسین؟ دوایین قامك دەڵێ: دە بێ بترسین.

| | |
|---|---|
| حاجی لەگ‌لەگی گەرگەری، | سیمان دەخوابە شقی عەلی، |
| لەعاسمانان تەبەق تەبەق | لە عەرزیە کوچك وکەڵەك |

ماندونەبی (یان: بۆکوێ دەچی؟) عەبابەڵەك؟

گورگە شەوی، گورگانە شەوێ. بەرخە چکۆڵە کەم خەوی لێ بکەوێ. لورەی تۆی ناوێ لای لایەی دەوێ. دەڵێ لە ماڵی ئێمە وەدورکەوێ.

| | |
|---|---|
| بچووە ماڵی ئەبویابو | وشترە کەی بکە بە تێشو |
| خوری مەرەکەی بکە بە داوەدەزو | خۆی لێرە دەرکە زوبەزو |
| بچووە ماڵی کوللە خۆرەکان | زمانی بەدیان ببرە بەددان |
| چاوی ژنەکەی کوێرکە بە بێڵەکان | بەشکو بەجارێ ببنەوە لە کوڵمان. |

نیسێ نیسێ گرێ گرێ، بابت بچێته لەشکرێ، قەپاڵ قەپاڵ گوی داگرێ.
مامە پیرە بۆکوێ دەچی؟ دەچمە حەجێ و دێمەوە.
ئەدی ئەمن لەگەڵ خۆت نابەی؟ دەوەرە ڕەگەڵم کەوە.

# چون، لەگەڵ مەتەڵدا

ئەوە چییە؟ هەر بەدوای دادەچین و نایگەینێ؟

ئەوە چن؟ سواری نەزۆکی دەبم، دەچمە نەبڕانێ، دێنم نەڕوانێ؟

ئەوە چییە؟ سەری یەکەو بنی دو، بە قونی باب‌وبا پیرماندا هەڵچو؟

ئەوە چییە؟ کا چو مادان؟

ئەوە چییە؟ چومەسەر تە پۆڵکێکی، بانگم کردە هاواڵێکی، هەزارها تن بە جارێکی؟

بە جارێکی لە سەر ئاوێ، دەچمە بن ئاوێ.

پەیدا دەبێ لە ئاوێ، وەك بەفر لە بەر تاوێ، دەچێتە وە سەر ڕەنگی ئاوێ.

چومە دێیەکی هیچ کەس تێدا نی ، دو بەرخم دەخوارد هیچ ئێسك تێدا نی، سواری ئەسپێك بوم. هیچ روح تێدا نی.

راست و چەپی دەچێ کنی، ڕێگا و بانان هەڵدەچنی، دەچێ ماڵان دای‌دە کەنی.

قەڵای گێچی، ڕێی نیە تێی چی.

گای سور، کلکم بڕی چو ژور.

هەرچەندە چکۆڵەش بێ وڵاتی دادەگرێ، بەڵام بە فویەکی لە نێو دەچێ.

## چون، لەپاڵ زاراوەدا

بۆدەچی؟ لەبەرچی دەچی؟ کێ دەچێ؟ چلۆن دە چی؟ بۆکوێدەچی؟ بە چی دەچی؟ کەنگێ دەچی؟ لەگەڵ کێ دەچی؟ بۆ چەند ڕۆژان دەچی؟

ڕوح لە جێیەکی سەختدایەودەرناچێ!

بوم بەقەترێك ئا و وبەعەرزیدا چومە خواری!

گوێی لە کڵاوی چوتە دەرێ.

ئەوەندە ڕقی هەستاوە، بایدە برینانەوە ناچێ.

کەپۆی بگری گیانی دەردەچێ!

لێرەوارێکی وابو کەڵی لێ دەرنەدەچو.

لە جێیەکم دیوە، هەرچی دە کەم ناچمەوە سەری.

قەڵەمەکەم ئێستێ بەدەستەوە بو کەچی لێم‌ون‌بو، نازانم بە عەرزی داچووە خوارێ یان عاسمان هەڵی کێشا؟

بۆلای کاری چاك ناڕواو هەرسەری لەکاری خراپدە خورێ، وا دیارە شەیتان چووەدە کە لێشەیەوە!

قەرەچی، بە قوڕێ داچی!

بە ئاس (بەرد) و پەلاش (کوێن) داچو!

ئەگەر ئێستێ چوبای کەنگێ دەها تییەوە؟

ئەوە ڕێیەی بگرەوبەری مەدە، دەچییە بەرماڵان.

ئەوچووەتە حەقان، ئێمە ماوین لە ناحەقان.

بۆ مەندو ملایمێ دەچێتەوە سەربابی. دەڵێی سێویکن لەتت کردون.

ئەوکورە ئەوەندەوە بابی دەچێ هەربابی نەی کوتووە برۆبەولاوە.

داخم ناچێ، ئەوکراسەی کرییوم، لێم ون بووە!

سەد بریا بە بریایە خودای با، دەستێك ولاقێکت نەبا، بەلام وە من چوبای.

یاخودا ماڵت ئاوەدان بێ، نەشێوێ و تێك نەچێ.

چەند رۆژێکە دەستنوسی وتارەکەم لێ ون بووە، دەزانم یەکێك لێی هەڵگرتوم. لێم رونەکەلە گولا لەی بەولاوەتر نەچووە!

ناردومە ماستی بکرێ، چونی ئەوچونەبووە و هێشتانە گەراوەتەوە.

وەرە چوڵە مەشکێنەی، لەسەر دڵخواز. لەبیرم بێ ولەبیرت چێ.

لەگەڵ بەخت وئیقباڵ چ دەکرێ؟ بچمە سەرچۆمی سیروانێ ئیشك دەبێ.

نەچی لەرقان ئەوەندە چێشتەکەی بکوڵێنی کە ببێتە خەڵوز!

وابو، واچو بەکار نایە دەبێ کار بکەین.

تەلیسمیان لێ کردووە، بزانین بەچی دەچێ!

ئەو کابرایە ئەوەندە چاکە، بە کاڵە و پێتاوەوە دەچێتە بەهەشتێ.

کابرایەك بە کورەکەی خۆی کوت: نابێ برۆی بۆ هیچ کوێ و دوسمکەت ناچێ بو دەرێ.

پەپو، شیرەکەم هەڵچو، خەتام نەبو!

کەسێك بەکەرم بزانێ وحەقم لێ بخوا، بچێتە پەرپەرۆچکی ئاسمانێ حەقی خۆمی لێ دەستێنمەوە.

بانگتان هێشتبوم، لە بیرم چو بێم، خۆ نەچووە بچێ بۆ جارێکی دی.

میراتگرەکان لە سەر میراتێ بە شەر دەهاتن. یەکێکیان کوتی: من بەشی خۆمم ناوێ و بۆ خۆتان. ئەوە لە خێر و بێری چومە دەرێ!

# چون، لەگەڵ جنێودا

خودای دەکردچەندساڵ، لەمەوپێش سایەی ویمان لەسەر لادەچو!
خودایە، نەی مرێنی، دومانگی ئازگار لەسەرڕەقی پشتێ بکەوێ، کەس نەبێ چۆرە ئاوێکی بەگەروی دابکا ولایەکی لەشی بە جێ و بانانەوە، بچێ!
خودای دەکرد بە عەزاری‌دا دەچووە خوارێ!
ئاسمان دوروزەوی سەخت بۆدە بوئەمن مابام، لەشەرمان، هەی بەسەرتاشین چی!
بسکت بەبڕین چێ!
ئاخر بۆهێندە پێ نەچوی، بزانە ئەوخەڵکە لەسەرئەوکارانەی کە دەی کەی چەندە قسەت پێ دەڵێن! ئاەونزولەی خەڵکی، ڕۆژێکی بوٚت لەکەرەم دەکەوێ!
ئەوەندە بۆ بە ئێرەوئەوێ دا دەچی؟ خۆجاوی ڕا یەڵنا کەی، یاخـودا لەبەریەك چی!
بەسەرتەوە نەچێ، شەرتەوەك ماری پێتەوە بدەم!
خودای‌دەکردتوشی گێچەڵێکی وادەبو، سەریشی‌تێدادەچو وسەروسکەی لەسەردادەنا!
ڕەببی بێ سەروشوێن بچی، کەس بەدەردومەرگت نەزانێ!
خودای دەکرد گیانت دەردەچو وچاویشت پێ سپی دەبو!
بڕوەهەی پێ نەچو!
ئەوهە موئەمـەگەی لەگەڵم داوی لـە لات‌هیچە. دوێنێ بـە منت کوت:

ئەتۆهەرهیچت لەگەڵ من نەکردووە. جانەوە قسەیە؟ هەی ڕوت‌چێ!

ئەوهەمو هات و چووەت لە چییە؟ بۆلەگل ناکەوی؟

خودای دەکرد بە دەردی بابم دەچوی!

بە قوڕێ داچی، بۆ درۆی دەکەی!

پێم‌وایە چۆتە شاری سابلاغ. خودای دەکرد بەولاترەوە دەچوونەدەگەڕاوە!

ئەتۆئەوێ ڕۆژێ ئەودرۆیانە چبوکەدەت کردن؟ دەست لەوکارەنا شیرنە هەڵگرە! دەنانەونەختەئابرۆی کەماوتە، ئەویشی پێ دەچێ، ئـەوجاردەبێ لەنێوخەڵکی داسەر شۆڕبی!

ئەوەندە لوتی لە حەوایە، نواڵەی چەور وگەرم نەبێ بەگەروی ڕۆناچێ!

قسەیەکی بکە، وەقسان بچێ، مردوت مرێ!

چونی بێ وهاتنەوەی نەبێ!

زۆرلە خۆت دەرچوی و خۆت پێ زۆرە!

ڕەببی هەژدیهای حەوت سەر بچێتە خەونێوە!

# چون، لە گەل بەیت دا

لە بەیتی سوارۆی سنجانێ دا، ئاواهاتو وە:... چە ندم پێ کوتی سوارۆ، بە شقی خودای مەچووە، مە تەرێزی دە گەورە و گران، خۆماوێ (خۆمەهاوێ) کە ناری دە سواران...

لە بەیتی سوارۆی ئایشە گوڵێ دا، ئاواهاتو وە: ئەوەدە لێ سوارمەزنی، بەمن مەزنی، سەرت لە پۆلای چە نگت لە ئاسنی، هەرقە لاتێکی دە چییەی ئە تۆی لە بنی، ئەوحاکمێکی زەرە ندەیە ئەتۆی لە کنی، ئەوە سوڵتانی ئەستەمبوڵێ لە بەرسامی چو کە لە سوارێ من، ناسە کنی.

لە بەیتی لاسە شۆڕی باڵە کیان و خەزاڵی مەلا نەبیان دا، ئاواهاتو وە:... کیژە کە، دە مو لە عاست لە هەرزە کارە کە گەیشت، بە بیانو ی چونەدە ڕێ ڕێی ماڵە بابی داگرت...

لە بەیتی ناسرومالماڵ دا، ئاواهاتو وە: بە بازن، بەزولفی بە خە نە، قامکی بە ئە نگوستیلە، دە ستی دە داکو تە کە کی دارمەرحەم، دە چووە دەوری ڕە شماڵی ماڵماڵ ڕاستەی ڕە شماڵێی، بەزە ندی بە بازن سە بر وکەسە بر وکەدە یکوتاوە..

لە بەیتی سەیدە وان دا، ئاواهاتو وە:... ئاوی کوێستانان دێنە خوارێ چە ندبە تو ندی، چە ند بە تیژی، هەڵدە ڕژێنە بن سو رە گوڵی سەربە گژنیژی.

دە جائەو کەسانەی خوداشناسن، وەرن ڕە جمم کەن، کێ دیو یە تی، لە دە ورە تی زەمانان لە سەر سێ کوڕان ڕا بوك بچنەوە ماڵی دە بابان، بە تارای سورو هەر بە کیژی؟...

لە بەیتی دمدمدا، ئاواهاتوە:... بانگێکم وە بەرخو لای ئەوی دیکەم وە بەر پێغمەمبەری ئاخری زەمانێ،بانگی دیکەم وە بەرحەزرەتی عەلی،رۆژی جومعەو جەماعەتان سواردە بێ لەدوڵدوڵی،دەست دەداتە زولفە قارێ، دەچێتە خەزای گاورقرانێ،بانگ دیم وە بەر سەوزە پۆشی لەحاجی خۆشی،لە ترشە کانێ...

لە بەیتی لەشکری دا، ئاوا هاتوە:... جا، ئەمن دە چومە جبەخانەی ئاغای چەلەنگ، لێم دەردە کێشان پێنج سەد رمبی کۆپ ڕەشی دارحەیزەرانێ... لێم دەردە کێشان پێنج سەد مەتاڵی گوێ فیلی کەرگەدەن، بن بە جولانە... لێم دەردە کێشان پێنج سەد بۆ روبدە وکو یتی قاپ ڕەشی کللك لەسەرچوانە...

لە بەیتی گەلۆدا، ئاوا هاتوە:... سەرکوڵمی ئەوێ نازدارێ بەمن بمێنی بە سورە گوڵە کەی دەئەوەڵ بە هارێ، ئەگەر بە حوکمی تەرزەوبارانێ بەمل یەك دادەچون لەئەوبەرئەوبەری دە کاولە سۆمایە.

لە بەیتی با پیر ئاغای مەنگوردا، ئاوا هاتوە:...

| | |
|---|---|
| رەسـواغـای مـێـردیـکـانـێ | سـوێـنـدخـۆرە بـە قـورئـانـێ |
| دەڵـێ: دەشـێـوێـنـم لاجـانـێ | مـا مـەش بـچـنـە تـارانـێ |

تێیان دە خەم قررانێ...

لە بەیتی مەم وزین دا، واهاتوە:... خوشکێ ئەزت ببم بەقوربانە، ئەمن جارێکی دە گەڵ پەریان چومەڕاوی چل شەووچل ڕۆژانە، لە پەریان هەڵبرام، لەمنی کردەوە کرێوەوبارانە، ڕێم سەرەودەرنە کرد، کەوتمە شاری جزیروبۆتانە، لەسەر کۆشکی یای زینێ دە بوم بەمیوانە...

لە بەیتی خەج وسیا مەند دا، ئاوا هاتوە:... خەجێش دە گەڵ پۆلی کچان، نەشمیلان، ئاسکۆلان، دەچووە گێلاخەومەندۆکێ، کچان بە داوێنی ئەو کێو و دۆلانە، وەردە بونەوە، کوران بە لایەکی دیکەوە...

لە بەیتی شێخی سەنعان دا، ئاوا هاتوە:

| | |
|---|---|
| ئـە گەردە بـیـنـم وردە خـاڵـی | لـە گەڵ قـەدێکی شمشـمـاڵـی |
| جـەرگ ودڵ بـۆ وی دە نـاڵـی | ئـەمـن دەچم بـە عـەبـداڵـی |

تۆنەت دیوە کیژی کاڵی...

لە بەیتی بارام و گوڵندام دا، ئاوا هاتووە:...

ئەگەرشێت نەبی وەنەبی دێوانە | تۆ وەکومەجنون نەگری بەهانە
---|---
نەچی بۆشاخان سوبحان سوبحانە | لەیلێت نادەنێ، ئەرێ جانانە

لە بەیتی سەعیدومیرسەیفوددین بەگ (سعيد ومير سيف الدّين بيگ) دا، ئاوا هاتووە:... هاتوم دانیشتوم بەسەرگەردانی، ڕوم نییە ئەگەر بچمەوە ئاوەدانی، قەلەمی تۆیە بۆخۆت دەزانی،...

لە بەیتی ناز وخدر دا، ئاوا هاتووە:

ها تنەخوارێ دەسرەو دەسماڵ | ڕوبەند لاچون لەسەر خاڵ
---|---
بازنە دەشکێن و خرخاڵ | بوبە قیزەو گاڵە گاڵ

لە بەیتی میهرو وەفا دا، ئاوا هاتووە:

وەختیشم لێ درەنگ بووە، هاتۆتەوەختی بانگی ئێوارێ، چاوت بەمن بمێنی بەئەستیرەی ڕۆژێ، کولمەت بەمن بمێنی بە گولی هەنارێ. سبحەینێ هەچی زوترە بۆم بچو بۆسەرکانی شێخان، کانی وڕوبارێ، با جیرەی ڕێگایەهەڵگرم، بەدیتن و بۆنی یارێ...

لە بەیتی شێخ فەرخ و خاتون ئەستێ، دا، ئاوا هاتووە:

قەسەم بەزاتی سوبحانی | گەلێک ئەبلەو هیچ نەزانی
---|---
ئاورت داوێمە خەرمانی | خۆشی نەبینی لە گیانی
لێت تێک چێ سەروسامانی | ئازای بەندەنت بگرێ ژانی
بەقورێ داچی تادەتوانی | داستون بێ لە سەپانی...

لە بەیتی کەڵ وشێر دا، ئاوا هاتووە:...

جێگای پادشاهان ئێرە قەلابو | دەرك وپەنجەرەی سەرپاك تەلابوو
---|---
لۆتی نەیان کردهیچ فکروئەندێش | بەرەوبارە گای پادشاچونە پێش...

لە بەیتی عبداللّه خان مُكری دا، ئاوا هاتووە:...

ئاغام، عەقڵت پەشوکاوە | یان پەریان دەستیان لێت داوە
---|---
دارە لەك بەقورێ گیراوە | ئاوزۆرە دەڵێی سێلاوە
قوڵێکی نەچووە بەولاوە | گەنم وجۆمان نەدێراوە...

## چون، له پاڵ هۆنراوه کانی شاعیران دا

**هێمن:**

ئەی ئەوانەی قەت لە بیرم ناچنەوە!
ئێستە بمبینن، ئەرێ دەمناسنەوە؟

**هەژار:**

بێهودە یە بیر وخەم، دڵت خۆش کە برا!
پرسیار نەکرا، بە شت درا، هەرچی درا.
تۆهێشتە نە هاتو یە جیهان ڕۆژی بەرێ،
ئەورۆژی دە بو بچیە دەرێ، دیاری کرا.

**گۆران:**

خۆزگەم بەسالێ رابردو عومری کورتی دڵداریم بو
لە پرهات ولە ناکاو چو یەك: پربە دنیائارە زو
دەریایەك تاسەئەمەدو جێ مابوم لە پاری مردو...

**عەلی با پیرئاغا:**

شەماڵ دەخیلم بچو بۆلای لەیل
بۆلای لەیلەکەی بێ وەفا وبێ مەیل
پێشکەش کە نامەی دەرون لە غەم کە یل...

**نالی:**

ئیسباتی خەت وخاڵە بەسەد دیدەیی گریان،

ناچێتەوە ئەونوختە لە نێودیدەیی تەڕ دا.

**پیرە مێرد:**

مەگری مەناڵە با بەخە فەت دڵشکست نە بن،

نەختێ لە لات ئەمێننەوە بۆ بەهەشت ئەچن.

**حاجی قادر کۆیی:**

یەکێکی نا یەتەوەچونیان هەرئەو چونە،

لە شێخ وعالیم وجاهیل، لە پادشاه و گەدا...

**زێوەر:**

گەرچی ئەرزی هێندبڵندی وەختەلای من بچیە عەرش،

واسیتەی سەربەستی و ئیجرایی ئایینی منی...

**ئەدەب:**

لەورۆژەوە جانا! نەزەرت لێمە کەلا برد،

چونی سەروماڵم بە خوداهەرلەنەزەر دا...

**طاهربیگ (تاهیربەگ):**

نەماوە حاڵەتوژینم، لە دەس چو ڕوحی شیرینم،

ڕەفیقان با بکەن شینم، سەدای گریە و فەغان با بێ...

**صافی:**

سەبری ئەییوبم لەکوێ بو وعومری نوحم چۆن دەبێ،

پێنج ودو ڕۆژێکی ماوە، ڕوح کە چو ناییتەوە...

**ثانی:**

دڵیشم چو گوڵیشم چو، کە یاری گوڵعیزارم چو

نەماژینم، لەگەڵ خۆشی بە تاراجی نیگارم چو...

**صەفوەت:**

سەری عەقڵم لەدەستم چو، کە ماڵ وهۆش وعیلمم چو

ئومێدی وەسلی یارم چو، مەدەد یا ساکینو لبەغدا.

سوزی:

زەمان شێوا زەمین هاژا کە ئەو چو،

بەڵێ کەوچو لە عالەم قەدری کەوچو...

ئەدیب:

ئاوارەو خوێنخۆرە، مەگەر وامیقی عەزرام،

لۆمەم چدەکەن، کوشتەوسەر گەشتەیی لەیلام،

بۆدانەیی خاڵت بەفریو چوم، دڵی کێشام،

غەرقی غەم و سەوداسەرو ئاشوفتەوشەیدام...

وەفایی:

پەردەی کراسی لاچوپشکوت بەهەردو لێوان،

گوڵ وشەکردە باری لە کوچەی باغی سێوان،

زولفی ڕژانە کوڵمی وەدەرکەوتن لە نێوان،

شەمس وقەمەرهەڵاتن دوێنێ بە نوێژی شێوان...

بێ کەس:

بیست وحەوت ساڵە تاڵە ژیانم — لەژێردەستی تۆزۆر پەرێشانم،

وەئینسان ناچم عەینی حەیوانم — کەی ڕزگاردەبم ماڵی وێرانم؟

دڵدار:

بە یادی ئەو دڵەی تینو — کەچۆن هات و وەهاش دەرچو...

بێتوئەسپێ چەندئەسڵ بێ، سواری چالاکی نە بێ،

قا بیلە، دەرچێ لە مەیدانی جیدال وجێگە ڕەوت...

شێخ ڕەزا تاڵەبانی:

خزمینە، مەدەن پەنجە لە گەڵ عەشرەتی جافا

مێرولە نەچێ چاکە بە گژ قوللەیی قافا.

کامران موکری:

ئەوی لە سامان نزیك بێتەوە — ڕەوشتی بەرزی بیرئەچێتەوە...

**قانیع:**

چەن خۆشە کە ئەورۆژە بڵێسەی گڕی ئاگر،
وەك بەرقی غەزەب دێتودەچێ لێرەوە تا چین...

**شێخ سەلام:**

دەست مایەی عومرم، لەدەستم دەرچو،
بە پەنجەی ئەجل، جەرگم کون کون بو،
ناگەڕێتەوە، کەسێ لەو دونیا،
تالێی بپرسین ئەحواڵی مرد و...

**موحەممەد تەوفیق وردی:**

بەفری چووەوەی پەڵەپەڵەبو ـ وەك مێگەلی مەڕ
لەبن لەشکری هەوری تەمی زو ـ ناهێڵێ کەسەر...

**سابیرسەعیدشوکری (رازی):**

کێڵێکی بەرز، بەقەدبا لای شەم — لەسەر گڵکۆم بێ بەبێ زیا دوکەم
لەڕوی بنوسن هۆنرا وەکانم — کەبەتیری شەم دەرچووە گیانم

**کاکەی فەللاح:**

چاوی نەترسێ، بچێ بێ پشو
گیانی نەبەزی، بکا بە تێشو...

**موحەممەد سالیح دیلان:**

پێ لەخرتك چوی بە ردی هەردی دەرد،
رەنگ هەڵبزڕ کاوبە هەناسەی سەرد...

**حەریق:**

گەردەچمەوە ساحێب، نیە هیچ مونیس و ساحێب
گەردێمە سەقز، ناری سەقەر والە جگەر ما...

**سوارە:**

ڕۆژپەڕە سارده کزەی بای زریان — کاتەبۆژینی لەدەس چو گریان...

سیف القُضات:

بـەلـەرزەدەچنـە فـریــزوچنینێ گریانەکاریان جێی پێکە نینێ!...

## چون، له نێو چیرۆك دا:

له چیرۆکی داپیره و مام ڕێوی دا: (دایه) پیره چو تیخه له یه کی هێنا وخێرا کلکی مام ڕێوی په ڕاند. مام ڕێوی گه لێك له داپیره پاڕاوه که کلکه که ی بداته وه. داپیره کوتی: بچووه (بچو) شیرم بۆ بێنه تا کو کلکه قوله ت بده مه وه. مام ڕێوی چووه کن بزن، کوتی بزن: شیرده بۆداپیر، داپیر کلکه قولەم بداته وه، بزن کوتی بچو بۆ کن دار، گه لام بۆ بێنه تاکو شیرت ده مێ. ڕێوی چووه لای دار، کوتی دار، گه لاده بۆ بزن، بزن شیردا بۆدا پیر، دا پیر کلکه قولەم بداته وه. دارکوتی: بچووه سه رکانی، ئاوم بۆ بێنه تاکو گه لات بده مێ، ڕێوی چووه سه رکانی، کوتی: کانی ئاوده بۆدار، دارگه لادا بۆ بزن، بزن شیردا بۆداپیر، داپیر کلکه قولەم بداته وه...

چون، له چیرۆکی مه ڕۆکه و بزنۆکه دا:

... که هاوین داهات بزنۆکه به مه ڕۆکه ی کوت بابچین خانوچکه یه ك بۆ خۆمان دروست که ین، که زستانێ بچینه نێوی و خۆمان له سه رما وگورگ و... بپارێزین.

مه ڕۆکه کوتی: من دوگی خۆم خۆش بێ. خانوم بۆچییه؟ بڕۆ بۆ خۆتی بکه.

بز نۆکه ش ڕۆیشت خا نوچکه یه کی بۆخۆی پێکه وه نا. ده گه ڵکو زستان داهات بزنۆکه چووه خا نوچکه که یه وه...

چون، له چیرۆکی گورك وبزن دا:

بزن چووه سه ربانی ماڵی گورك وده ستی کرد به ته په ته پێ.

گورگ قه ڵس بو کوتی:

ئه وه کێیه له بانم ته په ته پێ ده کا؟

کاسەوکەوچکم لێ خوڵاوی دە کا

لە میوانانم شەرمەسار دە کا

بزنیش پێ ی کوت:

ئەوەمنم، منمنۆکە   دوچاوم پێوەیە، بزبزۆکە

دوشاخم پێوەیە، بێڵ بێڵۆکە   کێ خواردویە تیتلی من

کێ خواردویە بیبلی من   بێتە شەڕو جەنگی من...

**چون، لە چیرۆکی ڕێوی و مریشکە قوڵەی دا:**

مریشکە قوڵێك لە هەوارچیان بە جێ مابو وهەرلە هەورای ما بۆوە. ڕێوێك چووە زگی و کوتی: دە بێ هەرئێستی بتخۆم!

مریشکەکەش پێی کوت: جارێ لێم گەڕێ با هێندێکی دی خۆم قەڵەو کەمەوە و جوجکان هەڵێنم. جا، ئاغایەکی بە ماڵم، وەرە پێمان وەربەوبما نخۆولێمان تێر بە. ڕێوی بە قسەی کردو خۆی لێ هەڵبوارد. پاشان مریشکەقوڵە چوە کن مامهومەرەی را وکەرو نەقلەکەی لەنوکەوە بۆگێراوە و زۆردەستەوداوێنی مام هومەرەی بوکە: پەندێکی بەسەرڕێوی بێنێ (بهێنێ). وایان دانا، وەختێك مریشکە قوڵە جوجکەی هەڵێنان وڕێوی قرمی خۆی لێ خۆش کردن وچوە زگیان، بە مام هومەرەی رابگەێندرێ. سەردەمێکی پێ چو، مریشکە قوڵە جوجکەی هەڵێنان وڕێوی بە دوای ئەو نواڵە چەورانەوە داهات وچوە زگ مریشکە قوڵەی. ڕوی تێ کرد وهەڵیدایە:

هەچۆمەچۆمە   دایك وجوجکان دەخومە

دنیا بە کەیفی خۆمە!

مریشکە قوڵەش پێی کوت: توخولاّ وامەلێ، ئەمن دەترسێم. واچاکترە بڵێی:

مام هومەرەی پشت کەندی   بەخۆت وبە تولە قەندی

کەولی ڕێویت بەچەندی؟

## هەرلەم دانەرە:

١ـبنەچەی کوردان وبنچینەی زمانی کوردی (لەچاپ دراوە)

٢ـواپسین سخنان بزرگان (لەچاپ دراوە)

٣ـازمعادن فکری بهرە برداری کنیم (لەچاپ دراوە)

٤ـشەرح ووەرگێرانی بەیت وباوی «سەیدەوان» بەفارسی (چاپ نەکراوە)

٥ـقاموسی نێوەدوانەکانی زمانی کوردی (چاپ نەکراوە)

۶-دربارۀ منظومۀ شیخ صنعان به زبان کردی (گویش های بادینانی، سورانی، اورامی) وزبانهای فارسی وترکی (چاپ نەکراوە)

**سروش لەچاپی‌داوە:**

*گەڕانە وە سەرخۆ*، نوسەر: دوکتور شەریعەتی، وەرگێڕ: صدیق بۆرەکەیی.
٤٥ قەران

*کوردستان و ئیمپریالیزم*، کۆمەڵی غەم خوارانی گەلی کورد.
٣٥ قەران

*عیرفان، بەرامبەری، ئازادی*، نویسنی: دوکتور شەریعەتی، وەرگێڕ: هەژار.
٣ تمەن

*دایە! باوە! کێ‌خراوە؟* نوسەر: دوکتور شەریعەتی، وەرگێڕ: هەژار.
١٠ تمەن

*داهاتوی ئیسلام*، نوسراوی: سیدقطب، وەرگێڕ: صدیق بۆرەکەیی.
١٠٥ قەران

*سیمای موحەممەد*، نویسنی: دوکتور شەریعەتی، وەرگێڕ: صدیق بۆرەکەیی.
٤٥ قەران

*بەندی*، بۆنەمر «آیت‌الله طالقانی»، وەرگێڕ: هوشیار.
٢٥ قەران

*فەلەسیتن رزگار دەبی*، نوسەر: محمود حکیمی، وەرگێڕ: هوشیار.
٤ تمەن

*دیوانی مەلای جزیری*، هونراوەی: شیخ ئەحمەدی جزیری، هەژار شەرحی لێ کردوە.
١٥٠ تمەن

*ئینسان و بڕوا*، نوسراوی: ئوستاد مطهری، وەرگێڕ: محمد صالح ابراهیمی.
١٠ تمەن

*ئایین و ئەوین*، هۆنراوەی: سیّد مُحمّد سعیدی کوردستانی.
٣٠ تمەن

*کتێب سوتانی ئێران و میسر*، نوسەر: ئوستاد مطهری، وەرگێڕ: عەزیز حەسەنخانی.

١١تمەن